

یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

21
ساڵی دووەم
شوباتی 2010



## مرۆڤ بۆچی خۆی دەکوژێت؟

## ژیان...
## نوێبوونەوەی بەردەوام!



## ئازاردانی ئافرەتان بە هۆی زەنگی مۆبایلەوە!

## تەنها خەندەیەك!

## تیرۆرکردنی تواناکان!



## بەڕێوەبردنی
## تێچوون لە هەلومەرجی رکابەریدا

The first Magazin Especialized in
Management
and Human Development in Kurdistan

# بریار

مانگنامەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

سالی دووەم - ژمارە 21 - شوباتی 2010


**بە ڕێوەبەری نووسین**

بەرزان ئەبوبەکر

**سکرتێری نووسین**

ئەسکەندەر ڕەحیم

**ب: پەیوەندییەکان**

محەمەد هاشم محەمەد

**دەستەی نووسەران**

هاژە شێروانی — پەیمان بەرزنجی

بێگەرد هەورامی — پەری شێخ کەریم

وەهاب حەسیب — محەمەد مێرگەیی

**ڕاوێژکاری یاسایی**

پارێزەر: ئازاد محیدین

**دیزاین**

جەمال دەروێش

پشتیوان عەبدوڕەحمان

**بەشی ریکلام**

موسلیم محەمەد

٠٧٥٠٧٦٠٢١١٦

تیراژ: ٣٠٠٠ دانە

چاپخانەی سەردەم

**خاوەنی ئیمتیاز**

ئەندازیار مەسعود تاهیر ڕۆژبەیانی

**سەرنووسەر**

عادل محەمەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com





















**بۆ دابەشکردنی بریار**

**هەولێر: خانەی سیروان** ٠٧٥٠٤٦٧٢٩٦٣

**کەرکوک:** ٠٧٧٠٨٥٦٣٧٢٤ **هەڵەبجە:** ٠٧٧٠١٩٣٣٩٦٧ - ٠٧٥٠١١٢٩٤٢٧

**دەربەندیخان:** ٠٧٧٠١٥٨١٠١٨ **کفری:** ٠٧٧٠١٥٦٦٨٧٦ **کەلار:** ٠٧٧٠٢١٠١٢٨٨

**چەمچەماڵ:** ٠٧٧٠٨٥٥٠٥٨٦ **کۆیە:** ٠٧٧٠١٥٤٩٧١٤ **سۆران:** ٠٧٥٠٤٥٠١٩٣٣

**چۆمان:** ٠٧٥٠٤٥٦٧٩٩٢ **قەڵادزێ:** ٠٧٧٠١٥٨٥٢٠١ **رانیە:** ٠٧٧٠٢٢٩٣٦٢٨

**ناونیشانی گۆڤار**

سلێمانی- شەقامی سالم- تەلاری سلێمانی مۆڵ، نهۆمی/٢

بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە

07702178682 3193946

E-mail: bryarmagazin@gmail.com

هەولێر- 07507658535 07504463230

**حساب بانکی گۆڤاری بریار**

**بانکی کوردستانی نێودەوڵەتی سلێمانی: ٣٣٧١**

ئەگەر ئێمە بە خراپە
وەڵامی ئەو کەسە بدەینەوە
کە خراپەمان لەگەڵدا دەکات..
کەی خراپە بنەبڕ دەبێت؟!



سەرنووسەر

# ژیان... نوێبوونەوەی بەردەوام!

بارانو بەفرو تەرزەی ئەم ساڵ، مایەی دڵخۆشیو ئارامیو خۆشحاڵی هەموو دانیشتوانی ئەم کوردستانە شیرینە بوو.

دووبارە سروشت بەرگی سەوزی پۆشیو خورەی ئاوی سازگاری سەهۆڵاو بە گوێچکەمان ئاشنا بووەوەو گوڵو گوڵزارو نێرگز، دەشتو دۆڵو چیای رازاندەوە.

جارێکی تر سروشت وانەی نوێبوونەوەو ژیانەوەی بۆ وتینەوەو پێی گوتین: کە ژیان بە نوێبوونەوەوە جوانو زیندووەو هەر کاتێك ژیان نوێبوونەوەی تێدا نەما، وەکو دیمەنی وشکە ساڵیو بێ بارانی دەبزرکێو تامو خۆشی ژیان لە دەست دەداتو لە یەك خاڵی جەق بەستوودا دەمێنێتەوە.

هاوکات پێویستە ئێمەی مرۆڤیش هەست بە زەرووڕەتی نوێبوونەوەو نوێخوازی بەردەوام بکەینو خۆمان ئەکتیڤ کەین لەسەر نوێبوونەوە، چونکە هەر ئەوە مانا بە ژیان دەبەخشێتو وامان لێدەکات سوود لە ژیان وەربگرینو دەوروبەریش سوودمەند بکەین!

بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە هەمیشە لە بیرکردنەوەیەکی بەردەوامدا بین بۆ گەیشتن بە هەر پێشنیارێکی نوێ کە دەبێتە مایەی داهێنانی نوێو پێشکەوتنو گەشەپێدان لە هەموو بوارەکانی ژیاندا.

وێڕای ئەوەی پێویستە لەسەر ئاستی ژیانی کەسی خۆمان هەمیشە بەرنامەی نوێمان هەبێت بۆ نوێخوازی لە بیرکردنەوەماندا.. پێش هەموو شتێك لە تێڕوانینو بۆچوونەکانماندا، لە بەرنامەی کاری رۆژانەشماندا، لە گرنگیدان بە خوێندنەوەو بەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنبیریدا.

هەروەها پێویستە لەسەرمان هەموو تاکەکانی کۆمەڵ بۆ ئەم مەسەلەیە هان بدەینو گوێ لە پێشنیارو بۆچوونەکانیان بگرین.

بۆ نموونە: تەنها لە کۆمپانیای (تویۆتا)دا، کارمەندەکان ساڵانە دوو ملیۆن پێشنیار پێشکەش بە کۆمپانیاکەیان دەکەنو لەو ژمارەیەش ٨٥٪ی پێشنیارەکان جێبەجێ دەکرێت، چونکە لە بۆشاییەوە درووست نەبوونو لە خۆڕا نەهاتوون.. بەڵکو ئامانجێك لە پشتییەوەتی.

تا بوارەکانی گۆڕانو نوێخوازیش فراوانترو جۆراو جۆر تر بن، ئامانجەکانیش زۆرتر دەبن.

کەواتە با لە هەموو بوارەکاندا هانی نوێبوونەوەو پێشنیاری نوێو بیرۆکەی نوێ بدەینو لە نوێخوازی نەترسین.

با لە قوتابخانەو خوێندنگەکانداو لە هەموو فەرمانگەکاندا هانی هەموو ئەندامان بدەین چ بیرێکی نوێیان پێیە با بە ڕاشکاوی پێشکەشی بکەن.

ئەو کاتە ژیان دەبێتە هەمیشەبەهارو بەردەوام بە بیری نوێو پرۆژەی نوێو بەرنامەی نوێوە، ژیان بەردەوام لە ژیانەوەو نوێبوونەوەو پێشکەوتندا دەبێت و هەموومان هەست بە تامو چێژی ژیان دەکەین.

# کارگێڕی بە گوفتار

لە کاتێکدا پێنووسم لە دەستدایە، هیچ بە لامەوە گرنگ نییە کە تاجێکم لە سەردا نییە.
ڤۆڵتێر

هەموو مرۆڤەکان بیر لە گۆڕینی جیهان دەکەنەوە، بەڵام کەس بیر لە گۆڕینی خۆی ناکاتەوە.
تۆڵستۆی

گەورەترین سەرکەوتن ئەوەیە کە بە سەر خودی خۆتدا زاڵبیت. ئەفلاتوون

پێویستە ئامانجمان سوپایەکی مەشقپێکراو بێت، نەك سوپایەکی گەورە.
جۆرج واشنتۆن

دیبلۆماسییەت بریتییە لە فێربوونی هونەری زانینی ئەو شتانەی کە پێویستە نەیانڵێیت.
شکسپیر

خێزانێکی بەختیارم بدەرێ، کەلێکی بەختیارت دەدەمێ.
عەباس مەحمود عەقاد

گەر دەتەوێت داهاتوو بدۆزیتەوە، رابردوو بخوێنەرەوە. کۆنفۆشیۆس

تائێستا رووینەداوە هیچ کەلێك بەرێکەوت پێشکەوتبێت. د. زەکی شەعراوی

# کارگێڕی بە چیرۆك

## تیرۆرکردنی تواناکان

جەنابی سەرپەرشتیار بەڕێوەبەری یەکێك لە قوتابخانە بنەڕەتییەکانی شارۆچکەیەکی ئاگادار کردەوە کە بە نیازی سەردانی قوتابخانەکەیانە، ئەو رۆژەی کە بەرەو قوتابخانەکە بە رێکەوت، لە رێگادا ئۆتۆمبێلەکەی تووشی گرفتێك هات، کە لە ئەنجامدا لە کارکەوت، ئەویش بە سەرسامییەوە لە نزیك ئۆتۆمبێلەکەی راوەستاو نەیدەزانی چی بکات!

لەو کاتەدا کە سەرپەرشتیار بەوپەڕی نیگەرانییەوە لە ناچاریدا لە نزیك ئۆتۆمبێلەکەی راوەستابوو، قوتابییەك بەوێدا تێپەڕیو چاوی پێکەوت، زانی کە ئۆتۆمبێلەکەی گرفتێکی تێدایەو لە کار کەوتووە، لە جەنابی سەرپەرشتیار نزیك بووەوەو دوای سڵاو پرسی: دەتوانم یارمەتیت بدەمو هاوکاریت پێشکەش بکەم؟

سەرپەرشتیاریش لەو قەیرانەدا لە وەڵامدا گوتی: هیچ لە چاکردنی ئۆتۆمبێل دەزانی؟

قووتابییەکە زۆر درێژەی بە وەڵامی پرسیارەکە نەداو یەکسەر بۆنیتی ئۆتۆمبێلەکەی هەڵدایەوەو دەستی بە کاری خۆی کردو پاش ماوەیەك داوای لە جەنابی سەرپەرشتیار کرد ئۆتۆمبێلەکەی بخاتە گەڕ، ئۆتۆمبێلەکە کەوتە کارو سەرپەرشتیار لەو کێشەیە رزگاری بوو!

سەرپەرشتیار بە گەرمی سوپاسی قوتابیەکەی کرد، بەڵام ویستی نهێنی ئەوە بزانێت کە بۆچی لەم کاتەدا لە قوتابخانە نییەو چی دەکات لێرە؟!

قوتابییەکە لە وەڵامدا گوتی: (ئەمڕۆ جەنابی سەرپەرشتیار سەردانی قوتابخانەکەمان دەکات، منیش لە پۆلەکەدا تەمەڵترین قوتابیم، لەبەرئەوە مامۆستاکەم پێی گوتم: بڕۆرەوە بۆ ماڵەوە بۆئەوەی خەجاڵەتمان نەکەیت!)

لەم چیرۆکەوە چی فێردەبین:

١- پێوەری ئێمە بۆ زیرەکیو تەمەڵی قوتابییەکان تەنها فێربوونی وانەکانی قوتابخانەیەو رەچاوی هیچ پێوەرێکی تر ناکەین.

٢- دۆزینەوەی تواناو بەهرەی منداڵەکانمان، پێویستە لە سەرەتای تەمەنی منداڵییانەوە دەست پێ بکات، تا بتوانین ئاراستەیەکی دروستییان بکەین، بۆئەوەی سوود لە بەهرەکانیان وەربگرین.

٣- هەموو منداڵەکان زیرەکنو لە بنەڕەتدا هیچ منداڵێك تەمەڵ نییە، لێکۆڵینەوەکان ئەوە دەسەلمێنن هەموو منداڵەکان کە لە دایك دەبن ئاستی ژیریو زیرەکییان وەکو یەك وایەو لە ١٪ی رێدەکەوێت کە منداڵێك ئاستی نزمتر بێت، بەڵام بە داخەوە لە دواییدا ئەم رێژەیە پێچەوانە دەبێتەوەو لە (١٠٠) منداڵ جاری واهەیە یەك منداڵ بە زیرەكو لێهاتوویی لە قەڵەم دەدرێتو ئەوانی تر یا بە زیرەکی مامناوەندی یا بە تەمەڵ ناوزەد دەکرێن.

٤- مەرج نییە هەموو منداڵەکانمان ببنە مامۆستاو پزیشك بەڵکو ئێمە پێویستمان بە هەموو پسپۆڕییەکان هەیەو میکانیکیو کارەباییو دارتاشیو پسپۆرو..... هتد، هەموو پێویستن.

٥- بە داخەوە نەك هەر لە منداڵیدا بەڵکو تا قۆناغی زانکۆو دوای زانکۆش تەنها کۆی نمرەکان پێوەری ئێمەن، بۆ دیاریکردنی قوتابی زیرەكو بەهرەمەند.

لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە کە ئەگەر خوێندکارێکی بەهرەمەند نمرەکەی نزم بێت بیەوێت بچێتە بەشێك کە تیایدا بەهرەمەندە نایەڵن ئەگەر نمرەکەی لەو بەشە نزمتر بێت.

بەڵام ئەگەر قوتابییەکی نمرە بەرز بەهۆی گرفتەکانی ژیانەوە لە کۆلێژێکی بڵندەوە دایبەزێنێ بۆ خوارتر، کەس رێگای لێ ناگرێتو ناڵێت حەیفە بۆ تۆ لە کۆلێژی پزیشکی یان یاساوە دایبەزێنیت بۆ پەیمانگا، ئەوەش ئەوە دەسەلمێنێت کە ئێمە هیچ بە تەنگ وزەو تواناکانەوە نایەینو بە لامانەوە گرنگ نین!

٦- با هەر کەسە لەو بوارەدا بە کاربهێنین کە تیایدا بەهرەمەندەو ئارەزووی لێیەتی، ئازادی بە نەوەکانمان بدەین خۆیان دوارۆژی خۆیان هەڵبژێرن.

# سەرەتایەك لە زانستی ڕێكخستن

هاژە شێروانی

## سەرهەڵدانو بەرزبوونەوە لە دیزاینی هەرەمی ڕێكخستن

لە بەرئەوەی ڕێكخراوە بچوكەكان گەشە دەكەنو گەورە دەبن، ئاساییە كە بە شێوەیەكی سروشتی بە كۆمەڵێك قۆناغدا تێپەڕبن، لە بەرەو پێش چونیشیان یەكەكانی ڕێكخستنی وەك (بەشەكانو كارگێڕییەكان) سەرهەڵدەدەن، لەگەڵ ئاستەكانی ڕێكخستن (كارگێڕی باڵاو مامناوەندو نزم)، یەكەكانی پاڵپشتی (توێژینەوەی بازاڕسازیو سیستەمی زانیاری، كاروباری یاساییو پەیوەندی گشتیو...هتد)، لەگەڵ سەرهەڵدانی چالاكیو كاری ڕێكخستنی نوێ وەك (وەسفكردنی پسپۆڕییەكانی ڕێكخستن، وەسفكردنی كارەكان، پێدانی دەسەڵات، بنیاتنانی ڕۆشنبیری ڕێكخستن)، هەر بەم شێوەیە لە زنجیرەی دەیەمی زانستی ڕێكخستن هەوڵ دەدەین كە بەم شێوەیەی لای خوارەوە ئەم زنجیرییە بخەینە ڕوو:

یەكەم/سەرهەڵدانی یەكەكانی ڕێكخستن.

دووەم/ سەرهەڵدانی ئاستەكانی ڕێكخستن.

سێیەم/ سەرهەڵدانی یەكەكانی پاڵپشتی.

چوارەم/ سەرهەڵدانی كارو چالاكی ڕێكخستن.

### یەكەم/ سەرهەڵدانی یەكەكانی ڕێكخستن:

لێرەدا ڕێكخراوە قەبارە بچووكەكانو تازە دامەزراوەكان پێویستیان بە یەكەی ڕێكخستن نییە، هەر وەك سەوزەفرۆش كە یەكەی ڕێكخستنی تیا بەدی ناكرێت، هەر وەك زۆرێكیشیان پێویستی پێی نابێت كە لە چوار دەورمان هەستیان پێ دەكەین وەك شوێنە بازرگانیو پیشەسازییە بچووكەكانی وەك سەوزە فرۆش، میكانیكی ئۆتۆمبێل، كارەباچیو ماسیگر، گۆشت فرۆشو دارتاش... هتد، هەر هەموویان پرۆژەی تاكو بچووكن پێویستیان بە بوونی هەرەمی ڕێكخستن نییە تا یەكەكان بگرێتە خۆی.

لە هەندێك جاردا كات دەتوانێت زامنی ئەو گۆڕانكاریانەمان بۆ بكات، كاتێك كە قەبارەی كارەكان گەورە دەبنو داواكاری لە سەر بەرهەمو خزمەتی ڕێكخراو زیاد دەكات، بە جۆرێك كە خاوەن كار بە تەنها ناتوانێت تەحەكومیان پێ بكاتو لێرەدا پێویستی بە ژمارەیەكی زۆر لە كرێكار دەبێتو لە سەریەتی كە قەبارەی كارەكانی دابەش بكات لە نێوانیان، ئەمەش وا دەكات كە هەر یەكێك پسپۆڕ بێت لە بواری كارەكەیو بەرپرس بێت لێی، بۆ نموونە وەرشەیەكی بچووكی ئۆتۆمۆبیل چاككردنەوە فراوان بێت بە جیاكردنەوەی كارەكانی هەر یەك لە بەرپرسی میكانیكیو هتد، لە كارەباییو ئاسنگەریو كاری تر، بە كەمێك بەرەو پێش بردنی لە قەبارەی دەتوانرێت كە بكرێتە یەكەی سەربەخۆ، لێرەشەوە یەكەكانی ڕێكخستن بۆ یەكەم جار لە ژیانی ڕێكخراو سەرهەڵدەدات، ئەمەش بەرەو پێشچوونێكی ئاساییە لە ژیانی ڕێكخراودا، جۆرێكیشە لە سەرهەڵدانو بەرزبوونەوە تیایدا.

لەگەڵ پێشكەوتنی قەبارەی كارەكان، هەندێك جار ڕێكخراو كۆشش دەكات بۆ كردنەوەی لقی نوێ، وەكو وەرشەی ئۆتۆمبێلو سەوزەفرۆشو چێشتخانەی بچووك لە كۆشش دەبن بۆ پێشكەوتنی سروشتی بە كردنەوەی لقی نوێی تر لە ناوچە جوگرافییە جیاوازەكان، ئاساییە كە خاوەنكار نەتوانێت بە سروشتی بارودۆخەكە خۆی تەنها سەرپەرشتی بكاتو كار بكات لە هەموو لقەكان، بۆیە لە سەریەتی كە جۆرێك لە سەربەخۆیی بوونی پێ بداتو لەمەشەوە یەكەی نوێ سەرهەڵدەدات، ئەمەش ناو دەبرێت بە دابەشكردنی كارگێڕییەكان بەم شێوەیەی خوارەوە:

## بەشی دەیەم



١- دابەشکردنی پیشەیی یا کار.
٢- دابەشکردنی جوگرافی.
٣- دابەشکردنی کاڵا (بە گوێرەی بەرهەمو خزمەت).
٤- دابەشکردنی بە گوێرەی کڕیار.
٥- دابەشکردنی بە گوێرەی پرۆسەکان.
٦- دابەشکردنی بە گوێرەی کات.
٧- دابەشکردنی بە گوێرەی ئەلفو بێو ژمارەیی.
٨- دابەشکردنی بە گوێرەی ماتریکس (مصفوفی).
٩- دابەشکردنی بە گوێرەی تێکەڵ (مرکب).

لە کاتی پەیڕەو کردنی یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی تایبەت بە دابەشکردنی ڕێکخراو بۆ کارگێڕییەکان یان بەشەکان، پێویستە لە سەرمان کە زامنی بوونی هەندێك پێوەرو ئاماژە پێدان بکەین کە دەبێتە هۆی سەرکەوتنی دیزاینی هەرەمی ڕێکخستنی نوێ، ئەم پێوەرو ئاماژانە بریتین لە:

١- دەستەبەرکردنی ئامانجی ڕێکخراو.
٢- دەستەبەرکردنی لە یەکچوونی ناوخۆیی لە نێوان یەکەکان.
٣- دەستەبەرکردنی سانایىو توانستی ئەدای کارکردن.
٤- دەستەبەرکردنی چاودێرىو ڕێککاری.

دوابەدوای گەیشتن بە دابەشکردنی کار بۆ یەکەکانو کارگێڕییەکان پێویستی بەوە هەیە کە بەڕێوەبەرانی کارگێڕی باڵاو ڕێکخەرانو بەرپرسان لە هەرەمی ڕێکخستن کە گفتوگۆی لەسەر بکەنو پێداچوونەوەی هەرەمی پێشنیار کراو بکەن بۆ یەکەو کارگێرییە نوێیەکان (کەواتە دوابەدوای ئەمانە بەڕێوەبەرانو ڕێکخەرانی هەرەمی ڕێکخستن دەتوانن کە پێوانەی یەکەکانیان بکەن بەوەی کە دیزاینەکەیان سەرکەوتووە یان نا، ئەمەش لە ژمارەی ڕابردووی گۆڤار واتە زنجیرەی نۆیەم لە خشتەیەکدا ئاماژەمان پێ کردووە).

**دووەم: سەرهەڵدانی ئاستەکانی ڕێکخستن:**

گوزارشت دەکات لە بەرەوپێش چوونێکی ئاسایی لە ژیانو مێژووی ڕێکخراوەکان، لێرەدا ئاستەکانی ڕێکخستن سەرهەڵدەدەن بە هۆی تووش بوونی ڕێکخراو بە گرفتێك کە ڕووبەرووی هەر یەك لە هەماهەنگىو پاڵنەرایەتی دەبێتەوە، ڕێکخراوەکانیش لە پێش کەوتنیانو گەورە بوونی قەبارەیان پێویستیان بە پسپۆری زیاترو دابەشکردنی کار هەیە، ئەوەی کە دەبێتە هۆی دروست بوونی گرفت لە هەماهەنگی نێوان ئەو یەکانەی کە سەریان هەڵدا لە دەرەنجامی دابەشکردنی کارو هەروەها لە دەرەنجامی سەرهەڵدانی یەکە ناسراوەکانو دوورەکان لە یەکتری، هەر وەك دابەشکردنی کارو پسپۆری دەبێتە هۆی دروست بوونی گرفت لە گەرمو گوڕىو پاڵنەرایەتی کرێکاران بە هۆی کاری دووبارەو وشكو بێزاربوون لە بە ئەنجام گەیاندنی.

لێرەدا ڕێکخراو کۆشش دەکات بۆ چارەسەری ئەم گرفتەو سەپاندنی جۆرێك لە چاودێرىو کارکردن بۆ هەماهەنگی نێوان یەکە لە یەك دوورەکان، لەسەر بەرزکردنەوەی گەرموگوڕىو هەڵسەنگاندنی ئەدائیان، ئەمەش ناکرێت تەنها لە ڕێگای سەرهەڵدانی ئاستەکانی ڕێکخستنی نوێ کە بەرپرسانێکی تێدایە کارەکەیان چاودێری کردنە (واتا هەماهەنگی نێوان یەکەکانی، بەرزکردنەوەی پاڵنەرایەتی بەردەستەکان، هەڵسەنگاندنی ئەدائیان).

بەرفراوان بوونی قەبارەی ڕێکخراو و ئارەزوومەندی لە سەر سەپاندنی جۆرێك لە چاودێری گەلێك ئاستی ڕێکخستن سەرهەڵدەداتو لێرەشەوە جیاکەرەوەی ستوونی شوێنی خۆی دەگرێت، بە واتای فووڵیی ڕێکخراو لە ژمارەی ئاستەکانی زیاد دەکات، ئەمەش دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ڕێکخستنێکی درێژ.

لە هۆکاری تریش کە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ئاستەکانی ڕێکخستنو لە گرنگترینیان (بە گوێرەی یاسای بارکینسون) کە ئارەزوومەندی بەڕێوەبەرانە لە سەر زیادکردنی ژمارەی بەردەستەکانیان (وەکو حەزێك)، کە دەبێتە هۆی زۆربوونی گرفت لە هەماهەنگىو پاڵنەرایەتىو ئەمەش پێویستی بە سەرهەڵدانی ئاستەکانی ڕێکخستنی نوێ هەیە بۆ سەپاندنی جۆرێك لە چاودێری کە کاربکات لەسەر چارەسەرکردنی گرفتەکانی هەماهەنگىو پاڵنەرایەتی، هەمان یاساش ئاماژە دەکات بۆ زۆربوونی ژمارەی کرێکارەکان کە وایان لێدەکات کە لە خۆیانەوە کاری زیاتر دروست بکەن لە کارگێڕییدا سەبارەت بە چاودێرىو پلاندانانو هەماهەنگىو چاودێرىو پێداچوونەوەو پشکنینو هاندان، هەمووشیان پێویستی بە جۆرێك لە گرتنەبەری ڕێو شوێنی ڕۆتینی فەرمی هەیە، کە ناتوانرێت کۆنترۆڵ بکرێت تەنها بە بوونی زۆرێك لە ئاستەکانی ڕێکخستنی نوێ، وەکو تەواوکارێكو درێژە پێدەرێك بۆ ئەم یاسایە دەتوانین بڵێین کە کرێکارەکان حەز بە دروست کردنی کار دەکەن تاوەکو ئەو کاتەی بەردەستیان پڕبکەنەوە لە دەوام کردن.

لێرەداو لە سەرهەڵدانی ئاستەکانی ڕێکخستن لە ڕێکخراو ئەوەی کە زۆر گرنگەو پێویستە کە شتێکی بخرێتە سەر ئەوەیە کە لە ژێر ڕۆشنایی پێشکەوتنی ڕێکخراو و بە تایبەت لە زیادبوونی قەبارەکەی، ئەمەش لەبەرئەوەی کە زیادبوونی قەبارەی بە واتای زۆربوونی ئاڵۆزىو تێکەڵییەکان لە شێوەی ڕێکخراوو چالاکیەکەىو پەیوەندییە ناوخۆییەکانی، لەگەڵ زیادبوونی ژمارەی کرێکارەکانو پسپۆڕىو دابەشکردنی کارو پێویستی بوون بە چاودێریش زیاد دەکات.

ئەرکی چاودێریش بریتییە لە ڕوودانی جۆرێك لە ڕێککاری ناوخۆیىو بە دواداچوونی ئەدای کرێکارانو هەڵسەنگاندنیانو ڕاستکردنەوەی هەڵەکانیانو پلانی کارەکانیان لە داهاتوو.

ئەمەو سەرەڕای ئەوەی کە ئەرکی چاودێری بریتییە لە هەماهەنگی نێوان یەکەکانی ڕێکخستن لە سەرهەمان ئاست، بە جۆرێك کە ئاستی ڕێکخستنی سەروو هەڵدەستێت بە دەستەبەرکردنی تەواوکارىو بە یەکبەستنەوەو هەماهەنگی لە نێوان کارەکانی یەکەکانی ڕێکخستن بۆ کرێکارەکان کە هەست بکەن کە ئاستی بەرزتر هەیە لە ڕێکخستندا کە دەتوانرێت لە داهاتوودا لە پیشەکەیان بەرزببنەوە.

# خاڵە بەهێزەکانت بخەرە گەڕ

و/ ئەسکەندەر رەحیم

## بەشی پێنجەم و کۆتایی

### هەنگاوی پێنجەم

### بەڕێك و ڕەوانی بدوێ·

دەستەیەکی بەهێز، چۆن پێکدەهێنیت؟

بۆئەوەی ببیتە بەڕێوەبەرێکی چالاكو دەستەیەکی بەهێز پێك بهێنیت، لەگەڵ کارمەندەکانت، بۆ وەستان لەسەر خاڵە بەهێزو لاوازەکانیان، هەروەها بۆ تۆکمەکردنی خاڵە بەهێزەکانیانو سستکردنی خاڵە لاوازەکانیان، وتووێژ بکە·

تابە ئاسانی ئەوەت دەست بکەوێت وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە:

**١- رۆڵو کاری سەرەکیت چییە؟**

رۆڵو کارت ئەوەیە گوێ بۆ وتەی کارمەندەکانت شل بکەیت· دڵنیاش بیت لە تێگەیشتنت بۆ تایبەتمەندیو کەموکورتییەکانیان، ئینجا بێ ئەوەی رۆڵی ناوبژیوان - لە راستیو دروستی ئەوەی دەیڵێن – ببینی، چەند بیرۆکەی نوێو هاندەریان بۆ بخەرە روو، هەوڵبدە لە بڕیاردان بەسەریاندا بابەتیانە بیت· ئەوەشت لەیاد نەچێت ئەوان لە دیاریکردنی خاڵە بەهێزو لاوازەکانیان، لە تۆ بە تواناترن·

**٢- ئەگەر کارمەندێکت خۆشی لە کارێکی دیاریکراو نەدەهات بەجۆرێك پێویستیت بەو کارەی هەبوو· توانای رزگارکردنیشت لەو کارە نەبوو، ئەو کات چی دەکەیت؟**

ئەگەر کارمەندێك داوای لێکردیت، لە کارو چالاکییەکی دیاریکراو کە هەردەم بە خاڵە لاوازەکانی ناو دەبات، دەست هەڵبگرێت، تۆش وا دەبینیت بەرژەوەندی کار وا پێویست دەکات، لە هەستان بەو چالاکییە بەردەوام بێت· زیانێك لەوەدا نییە، مافی خۆتە -وەك بەڕێوەبەرێك- کێت بووێت بە هەر کارێك رایسپێریت، بەڵام جار دوای جار هەوڵی گوشار خستنە سەرو بەزۆر دانە سەری مەدە· چونکە ئاکامەکەی مایەی رەزامەندی نییە، زیانیش بەو کارمەندەو چاکێتیو بیچمی کارەکە دەگەیەنێت· پاش ئەوەی بە کارمەندەکە دەڵێیت: درێژە بەو چالاکییە بدە، ئەوەیشی پێ رابگەیەنە کە دواتر پێکەوە تاوتوێی باسو خواسی رزگارکردنی لەم ئەرکەو راسپاردنی بە کارێك پێویست بێتو مایەی هێنانەدی خاڵە بەهێزەکانی بێت دەکەن· ئەمە ئەو شتەیە کە بەڕێوەبەری شایستە لەو بەڕێوەبەرە ئاساییانە جیادەکاتەوە کە -بڕیارەکانیان بێ ئەوەی بایەخ بەو خاڵە بەهێزانە یان لاوازانەی کارمەندەکان دەیدات - دەنووسنەوەو بەسەریاندا دەدەن·

**٣- ئەگەر کارمەندێکت دەستی لە کارێك بەرنەدەدا، تۆش دڵنییای ئەو لە کارەکەی سەرکەوتوو نییە، چی دەکەیت؟**

سەرەتا لە باشی هەڵسەنگاندنەکەت -بۆ ئەو هەڵوێستو بارە- جەخت بکەرەوە·

ئەم دوو پرسیارەش لە خۆت بکە:

أ- بۆئەوەی بتوانیت بابەتیانە بڕیاری لەسەر بدەیت، چەند جار بینیوتە بەو کارە هەڵبسێت؟

ب- سەرباری دووبارەکردنەوەی یەك بەدوای یەكو هەوڵە بەردەوامەکانی بۆ باش زانینی ئەم چالاکییە، ئایا هێشتا هەر دەسەوسانە لە وردەکاریو باشزانینی؟

رەنگە حەق بە تۆ بێت، چونکە ئەو کارمەندە لەم بوارەدا دەرکەوتوو نییە، ئەرکی تۆش وەك بەڕێوەبەرێك ئەوەیە سنورێك بۆ ئەم بارە دابنێیتو رووبەڕوو بە راشکاوانە پێی بڵێیت کە ئەنجام گەیاندنەکەی لەم چالاکییەدا، وێڕای گەرمو گوڕیەکەشی، بەهێز نییە، پێویستە بۆچوونەکەت بە چەند نموونەیەك بەهێز بکەیت کە نەبوونی تواناو بەهرەی پێویستی لەم بوارەدا دەسەلمێنێت، جا رەحمەت لەو کەسەی بە ئەندازەی بەڕەکەی خۆی پێی رادەکێشێ·

**٤- ئەگەر یەکێك لە کارەکان راسپاردنی کارمەند بێت بە چەند ئەركو بەرپرسیارێتییەکی نەگۆڕ، چی دەکەیت؟**

(بۆ نموونە وەك نوێنەری فرۆشەمەنی، پێویستە راپۆرت لە بارەی ئەو پەیوەندییە تەلەفۆنانەی بۆ فرۆشتن کراونو کردووتن، بە سەروتر پێشکەش بکەیت)· لەم دۆخەدا کارمەند رووبەڕووی چەند ئەركو بەرپرسیارێتییەکی نا بە دڵ دەبێتەوەو لەگرتنە ئەستۆشیدا سەرکەوتوو نابێت، ئەو پرسیارەی پێویستە وەك بەڕێوەبەرێك لە خۆتی بکەیت ئەوەیە: ئایا هەر بەڕاستی بەرهەمی ئەم کارمەندە لەسەر پێداویستییەك وەستاوە، دەبێت زۆربەی کاتی ئەنجام گەیاندنەکەی لەو ئەرکەدا بەسەر بەرێت؟

ئەگەر وەڵامت (بەڵێ) بوو، ئەوا رەنگە کاتی ئەوە هاتبێت، بۆ کارێکی دیکەی بیگوازیتەوە کە لەگەڵ ئارەزووەکانیدا بگونجێ· بەڵام گەر وەڵامت (نەخێر) بوو ئەوسا پێکەوە بەدوای رێگەکانی راییکردنی ئەو ئەرکەدا بگەڕێن· بە جۆرێك گوشارەکەی لەسەر کەم بکاتەوە، تا هەست نەکات سەختەو مایەی بێزاریو بێ ورەییە·

گەر لە نێوان خۆتو بەڕێوەبەرەکەت یان تۆو کارمەندەکەتدا، وتوێژی رێكو رەوان نەیەتە ئاراوە، ئەوا ورەو تینی هەمووان دێتەکزیو لە تۆکمەکردنی خاڵە بەهێزەکانیان دا شکست دەهێنن· خۆ ئەگەر بەڕێوەبەرو کارمەندەکان هەردوولا پێکەوە رێگەکانی تۆکمەکردن و خستنەگەڕی خاڵە بەهێزەکانیان نەگرتە بەر، ئەوسا هەلە زێڕینەکانی سەرکەوتنو دەرکەوتن بەسەر هەمووانداتێدەپەڕێت·

خۆشییەکەیشی لەوەدایە هەمووان هەوڵی قۆستنەوەی ئەم دەرفەتانەیانە!

دەتوانرێ ئەم خاڵانە بکرێنە تەوەرەیەكو ئەو وتو وێژە رێكو رەوانەی بەدەوردا هەڵبسوڕێ:

١- ئەو خاڵە بەهێزانەی کارمەندەکان هەیانە·

٢- ئەو شتەی کە لە ئەنجام گەیاندنێکی سەرسوڕهێنەردا،یارمەتیدەرێکی کارمەندەکانە·

٣- ئەو خاڵە لاوازانەی کارمەندەکان هەیانە·

٤- ئەو شتەی هاوکاری بەڕێوەبەر دەکات·· لە یارمەتیدانی بۆ کارمەندەکانی·

جێی باسە کارمەندی کەم ئەزموون، کەڵك لە وتووێژە رێكو رەوانەکان وەردەگرێت·· کە لەگەڵ بەڕێوەبەرەکەیدا لەبارەی خاڵە بەهێزو لاوازەکانیەوە دەکرێ· چونکە زۆربەی کات هەر بە باسکردنیان لەگەڵ بەڕێوەبەردا، ترسو سام دایدەگرێ·

بەشی دووەم و کۆتایی

# سپاردنی دەسەڵات... ئامرازێك بۆ گەشەپێدانی کارگێڕی

ئا/عومەرعەبدولقادر

کۆسپەکانی بەردەم دەسەڵات سپاردن:

ئەو هۆکارانە کە دەبنە ڕێگر لەبەردەم دەسەڵات سپاردندا، دەکرێت بەم شێوەیە دیاری بکەین:

١- «ئەو کارەی کە بە خۆت دەکرێت، بە کەسی تری مەسپێرە»، «ئەگەر دەتەوێت کارەکان بە باشترین شێوە ئەنجام بدرێت، ئەوا خۆت هەڵسە بە ئەنجامدانیان» زۆرێك لە بەڕێوەبەران گیرۆدەی ئەم بیروبۆچوونەن هانیان دەدات کە زیاتر پشت بە خۆیان ببەستن، ئەمەش هەڵەیەکی کارگێڕییە، چونکە کارگێڕی بریتییە لە ئەنجامدانی کارەکان لە ڕێگەی بەشداری پێکردنو بەگەڕ خستنی کەسانی ترەوە.

٢- هۆگری بەڕێوەبەران بۆ پلەو پایەو دەسەڵاتی راژەکەیانو ترسی لە دەستدانی پۆستەکەیان.

٣- کەمی شارەزایی بەڕێوەبەران لە ئەنجامدانی پرۆسەی دەسەڵات سپاردن.

٤- بێ توانایی‌و لاوازی هەندێ بەڕێوەبەر لە چاودێری کردنی کارەکان کە پێشوەخت ڕێگر بێت لە هەر لادانو کەموکوڕییەك کە لە ئەنجامی پرۆسەی دەسەڵات سپاردنەکەوە ڕووبدات.

٥- متمانە نەکردنی بەڕێوەبەر بە تواناو شارەزایی‌و لێهاتوویی‌و نهێنی پارێزی فەرمانبەرەکانی.

٦- کەم ئەزموونی بەشێك لە فەرمانبەرانو هەڵاتنیان لە ڕووی ڕاهێنانو مەشقکردنو شارەزایی‌و لێهاتووییەوە.

٧- نا ئامادەیی فەرمانبەران بۆ لە ئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتی پرۆسەکەو ترس لە شکست هێنانو ئەنجام نەدانی کارەکە وەك پێویست.

سوودو گرنگی دەسەڵات سپاردن:

سەبارەت بەبەڕێوەبەر وەك دەسەڵات پێدەر:

١- تەرخان دەبێت بۆ کاری سەرەکی پیشەکەتو زیاتر قاڵبوونەوەو پسپۆڕ بوون تێیدا.

٢- تا رادەیەکی زۆر لە دڵە ڕاوکێو ماندووبوونو فشاری کارەکەتو کاریگەرییەکانی دوور دەکەویتەوە.

٣- بەباشترین شێوە ژیانو کاتەکانت بەگەڕ دەخەیت، بەمەش بەدەرەنجامی چاکترو سەرکەوتووتر دەگەیت.

٤- لە ئەنجامی کاری نوێوە شارەزایی زیاترو تازەتر بەدەست دەهێنیتو دوور دەکەویتەوە لە ڕۆتینو دووپاتکردنەوەی هەڵەکان.

٥- خۆشەویستی‌و لایەنگری کارمەندەکان بەدەست دەهێنیت لەبەرامبەر ئەو متمانەیەی کە پێت بەخشیون.

سەبارەت بەکەسی دەسەڵات پێ سپێردراو:

١- لە میانی مەشق کردنو ئەو شتانەی کە فێری بوویت لە بەجێهێنانی کارە تازەکەتەوە، دەرفەتی پەرەپێدانی لێهاتوویی‌و تواناکانت بۆ دەرەخسێنێت.

٢- دەسەڵات سپاردن دەرفەتت بۆ دەرەخسێنێت تا خۆت بسەلمێنیتو شارەزایی‌و کارامەیی خۆت دەربخەیتو بەرەو پێش بچیتو پلەی زیاتر بەدەست بهێنیت.

٣- لە ئەنجامی بەجێهێنانی ڕاسپاردەکانو دەرکردنی بڕیارەکان بەویستی خۆتو بەبێ هیچ فشارێکی دەرەکی، هەست بە ڕازیبوون لە کارەکەتو ئاسوودەیی دەکەیت.

٤- سەرەڕای ئەوەی کە دەسەڵات پێدان هۆکارێکە بۆ هاندانی فەرمانبەران لە ڕێگەی پڕکردنەوەی پێداویستییە مرۆییەکانی وەك ڕێزلێنانو ستایش کردنو پەسەندکردنی کەسایەتیان.

سەبارەت بە دامەزراوەکان:

١- دۆخی کێبڕکێ کردن دروست دەکاتو فەرمانبەران هاندەدات بۆ دەسەڵات وەرگرتن ئەمەش بەپێی بەجێهێنانو چاکتر ڕاپەڕاندنی کارەکان دەبێت.

٢- دەستەی دووەمی کارمەندانی دامەزراوە ڕادەهێنێت بۆ سەرکردایەتی کردنی دامەزراوەکە لە داهاتوودا دەکرێت لەکاتی گونجاودا پشتیان پێ ببەسترێت.

٣- هەڵسەنگاندنو بەراوردکردنی ئاستی سەرکەوتنو بەرەوپێش چوونی فەرمانبەران لەسەر بنەمای چەند پێوانەیەکی بابەتی دەبێت نەك پێوانەی تاکەکەسی.

٤- بەشێوەیەکی گشتی پرۆسەی بڕیاردان باشترو خێراتر دەکات، لەبری ئەوەی بۆ هەر ئیشو کارێك چاوەڕێی بڕیاردەرکردنی کارگێڕی باڵای دامەزراوەکە بکرێت.

سەرچاوەکان:

-الأستثمار فى الموارد البشرية للمنافسة العالمية، مهندس محمد جمال الكفافى. ص ٩٠ — ٩١

-إدارە الاعمال، منهج حديث معاصر،د.طارق طه

-معضلات إدارية ... تبحث عن حلول، محمد فتحى ص ١٣٣- ١٣٤

-إدارە الوقت . خطوە ... خطوة، جيف ديفدسون ص ١٤ — ١٥

# چۆن کۆبوونەوە کورتو بەرهەمدارەکان دەبەستیت؟

زنجیرەی سێیەم

د. محمد احمد عبدالجواد
و: حسین محمود هەڵەبجەیی

هەنگاوەکانی بەستنی کۆبوونەوە:

* باشیی هەڵبژاردنی ئامادەبووان.
* دیاریکردنی کاتی کۆبوونەوە، بە گرنگی پێدانەوە.
* دانانی خشتەی کارەکان.
* دانانی ڕاپۆرتی کۆبوونەوەو پاراستنی.
* دانانی دەعوەتنامەو ناردنی.
* دڵنیابوون لەوەی کە پێویستت بە بەستنی کۆبوونەوە هەیە، لە ڕێگای ئاشنا بوون بە سوودە چاوەڕوانکراوەکانی.
* دیاریکردنی ئامانجەکانی کۆبوونەوەکە بە ئاشکرایی.
* دیاریکردنی شوێنی کۆبونەوەکەو ئامادەکردنی.

هەنگاوەکانی بەستنی کۆبوونەوە سەرکەوتووەکەت:

١- یەکەم جار دڵنیابە کە پێویستت بە کۆبوونەوە هەیە.

٢- ئاشنا ببە بە سودە چاوەڕوانکراوەکان لە کۆبوونەوەکەدا.

٣- بە ئاشکرایی ئامانجەکانی کۆبوونەوەکە دیاری بکە.

٤- بە چاکی بەشداران هەڵبژێرە لە کۆبونەوەکەدا.

٥- بە گرنگییەوە کاتی کۆبوونەوەکە دیاری بکە.

٦- بە باشی شوێنی کۆبوونەوەکە هەڵبژێرەو ئامادەی بکە.

٧- هەستە بە دانانی خشتەی کارەکان.

٨- هەستە بە دانانی بانگهێشت کردنو ناردنی.

٩- هەستە بە دانانی ڕاپۆرتی کۆبوونەوەو پارێزگاری کردنی.

## چۆنو بۆچی خشتەی کارەکان

بیست ئامۆژگاری پێشکەشە بە تۆ لە چۆنیەتی دانانی خشتەی کارەکاندا:

١- لە یادت بێت کە هەموو کۆبوونەوەیەك پێویستی بە خشتەی کارەکان هەیە، ئەمەش تا ئەو ڕادەیەی کۆبوونەوە ڕۆتینیو کتوپڕییەکانیش دەگرێتەوە.

٢- پێویستە ئەو خاڵانەی کە لە خشتەی کارەکاندا هاتوون مانادارو ئاشکرابن بۆ هەمووان، تاوەکوو وتوویژ لە سەر کارووبارەکانی دەرەوە نەگرێتە خۆی.

٣- دەتوانرێ ڕاوێژ بە هەرکەسێکیان بکرێت کە دەیەوێ بەشداربێت لە خشتەی کارەکاندا پێش دەسپێکردنی کۆبوونەوەکە.

٤- کاتێکی دیاریکراوو تەواو دیاری بکە، بۆ وتوێژی هەر بەندێك لە بەندەکانی خشتەی کارەکان.

٥- ئەگەر پێشتر کۆبونەوە کرابوو، ئەوە خشتەی کارەکانی پێشوو تاوتوێ کردنی خاڵێکی سەرەتاییە بۆ خشتەی کارەکانی ئێستا.

٦- لە یادت بێت پۆلێن کردنی خشتەی کارەکان پێویستە بە شێوازێکی لۆجیکیانە بێت، بە تایبەتی ئەگەر بەندێك وەستابێت لە سەر ئەو بڕیارەی کە وەرگیراوە بۆ بەندێکی پێشتر، یان لە سەر ئەو زانیاریانەی لەوێدا تەواو کراوە.

٧- دەتوانرێ خاڵە نارەحەتەکان لە پێشەوەی خشتەو کارەکاندا دابنرێن... بەڵام با لە سەرەتاشەوە نەبێت... ئەمەش زامنی وتوێژکردن دەدات لە سەر ئەو خاڵەو کە هێشتا ئامادەبووان هۆگری کۆبوونەوەکەنو چالاکنو بێتاقەتیان پێوە دیار نییە.

٨- ئەگەر هەندێ لە ئەندامان درەنگ دەهاتن، یان ناچار بوون زوو هەستن ئەوە ئەو بەندانەی پەیوەندی بەوانەوە هەیە، پێویستی بە پۆلێن کردنێکی تایبەت هەیە، پێش بخرێت یان دوابخرێت لە خشتەی کارەکاندا.

٩- خشتەی کارەکان نارەحەت مەکە، لە یادت بێت مامەڵەکردن لەگەڵ کارێکی گرنگدا دوای ئەوەی کات کۆتایی دێتو تواناو حەوسەڵەشت نامێنێت، خراپترە لەوەی کە مامەڵەی لە گەڵدا نەکەیت.

١٠- ئەگەر کۆمەڵە بەندێکی زۆر مابووبێت تەواو نەدەکرا، باشتر وایە کۆبوونەوەکە



بکرێت بە دوو دانیشتن.

١١- خشتەی کارەکان دابەش بکە بەسەر ئەندامەکاندا پێش دەسپێکردنی کۆبوونەوەکە، ئەمەش دەبێتە هۆی ناساندنی بابەتەکان کە وتوێژیان لە سەر دەکرێت، هەروەها بەشداربووان دەتوانن هزرو بۆچوونەکانیان لە خولگەی ئەو بابەتانەدا تاو بدەن.

١٢- خشتەی کارەکان لە سەرەتای کۆبوونەوەکەدا بخوێنەرەوە، رێگە بدە بەوانیش کارە بەهەند گرتووەکان دووبارە ریز بکەن.

١٣- دەتوانرێ خشتە ی کارەکان کاتی تێدابێت بۆ پشوو، تاوەکو هۆشو توانای ئامادەبووان نەپەستێنرێت.

١٤- رێگە بە ئەندامەکان بدە کە چیان پێ باشەو گرنگو پەلەیە، با ریزی بکەن لە دوو توێی خشتەو کارەکاندا.

١٥- دەتوانرێ تەنها ئەو بابەتانە ریز بکرێ کە پێشتر توێژینەوەی لە سەر کراوە. ئاگاداربە نەکەویتە ناو وتوێژی ئەو بابەتانەی کە بە تەواوەتی لێکۆڵینەوەی لە سەر نەکراوە.

١٦- لە بەردەم هەر بابەتێکدا ئەو بریارانە تۆمار بکە کە لەسەری دەدرێت یان دووبارە پێشکەشکردنی یان هەر شتێکی تر... خۆت رابێنە لەسەر ئەوەی لە بەندێکەوە نەچیتە سەر بەندێکی تر، مەگەر دوای بریار وەرگرتن لە سەری لە لایەن هەموو ئامادەبووانەوە.

١٧- لە یادت بێت ئەو شتەی کە دەتوانرێت لە دەرەوەی کۆبوونەوەکەدا ئەنجام بدرێت پێویست ناکات بخرێتە ناو کۆبوونەوەکە، وەکو خوێندنەوەی بابەتێك یان بلاوکراوەیەك، مەگەر لە لیستی توێژینەوە یان پێشکەشکردن بێت بۆ بابەتێکی تر.

١٨- با خشتەی کارەکانت درێژ نەبێت، لە یادت بێت ئەو کۆبوونەوەیەی لە دوو کاتژمێر زیاتری پێدەچێت کاریگەرییەکەی نامێنێت.

١٩- لە یادت بێت ئەو بە هەند گرتنە سەرەکییەی کاتی خشتەی کارەکان دیاری دەکات (سەرەتاو کۆتایی )یە، کە لە توانای ئەندامانـدا هەبێت پابەند بن پێوەی.

٢٠- لە یادت بێت سەرکەوتنت لەوەدا کە کۆبوونەوەکەت زۆر کاریگەر بێت بەستراوە بە ریز بەندیو سوربوون لە سەر سەرکەوتنو ئامادەباشیو داواکردنی کۆمەك لە خوای پەروەردگار.

لە یادت بێت کە خشتەی کارەکان جیاوازە لە لیستی ئامانجەکان/

ئامانجەکان شت گەلێکن هەوڵ دەدەین بۆ بە دیهێنانی، هەر ئەو شوێنەمان بۆ وەسف دەکات کە حەز دەکەین لە کۆتایی کۆبونەوەکەدا تیایدا بین.

خشتەی کارەکان، لیستی ئەو بوارانەیە کە دەتوانرێ وتوێژی لە سەر بکرێ یان سودی لێ ببینرێت، هەروەها خشتەی کارەکان بە درێژی هۆکار لە وتوێژی هەموو بەندێ یان ئەنجامێکی خوازراو کە لە پشتیەوە بێتە دی دیاری ناکات.

**بە کورتی:**

بۆ هەموان روون بکەرەوە کە پێویستە وتوێژ لە سەر چی بکرێت؟ ئامانج لە پشتی ئەوەوە چییە؟

دڵنیابە لە بەشدار بوونی هەموان لەو کارەدا...

بەڵێ لێرەدا جیاوازی هەیە!!

خشتەی کارەکان پێویستە بەم شێوەیە بێت

- ریزکراوبێتو رێکخراو بێت.
- گشتگیر بێت.
- هەموو بابەتەکانی تیادا روونکرابێتەوە.
- پێویستە پەیوەندییەکی ئاسایی لە نێوان بەندەکانیدا هەبێت.

بڵێ: وتوێژی لە سەر دەکەین لە خشتەی کارەکاندا.

خولی وەرزشی کە دەبەسترێت لە ٢٠٠٠/٧/١ تا ٢٠٠٠/٧/٥ لە لیستی کارەکانی لیژنەی وەرزشی کۆلێژدا دێت لەبواری (دانان - بەرێوەبردنی بەرنامە - ئاهەنگی کۆتایی - بەهێزکردنی خولەکە).

نەڵێیت... نەخێر!

# ئایا لەگەڵ کار و پیشەکەی خۆتدا گونجاویت؟

عەزیز ئالانی

وەڵامی ئەم ( ٤ ) پرسیارەی خوارەوە بدەرەوە بە (بەڵێ) یان (نەخێر)، پاشان لە کۆتاییدا ئەنجامەکەت وەربگرە:

**١- ئایا لە کارەکەی خۆت رازیتو دڵت پێی خۆشە؟**

واتە: بەزۆر ملکەچ نەکراویتو گوشارێکی دەرەکی ناچاری نەکردوویت، وەك خواستو هیوایەت، سەیری پیشەکەت دەکەیت.

**٢- ئایا پابەندیت بە کارو پیشەکەتەوە؟**

واتە: هەست دەکەیت کە سەرکەوتوویت، لە پیشەکەتداو هەست بەوە دەکەیت کە رۆژانە هەوڵی بەرەو پێشبردنی دەدەیت.

**٣- ئایا بایەخ بە پیشەکەت، دەدەیت؟**

واتە: پەیوەندییەکی گەرمو گوڕ هەیە لە نێوان خۆتو پیشەکەتداو پیشەکەت لای خۆت، وەك هاورێیەکی خۆشەویستت وایە.

**٤- ئایا لەگەڵ پیشەکەتدایت؟**

واتە: بەو پەری لێبرانەوە، لە خۆت دەبووریتو بەخشندە دەبیت، لە پێناوی پیشەکەتداو چاوەروانی قازانجو دەسکەوتێکی ئاساییو واقعییانەی لێ دەکەیتو خەیاڵییانە بیر لە داهاتی کارو پیشەکەت، ناکەیتەوە.

جا ئەگەر وەڵامی هەر چوار پرسیارەکە یان سێ پرسیار لەوانە، (بەڵێ) بوو .. ئەوا مانای وایە تۆ گونجاویت لەگەڵ کارەکەتدا.

زنجیرەی سێیەم

# چۆن دامەزراوەکەت پێش دەخەیت؟



و/ ئاوات جمال

**رێگاکانی زیادکردنی کاریگەری راهێنان لە دامەزراوەکەتدا:**

راهێنان یەکێکە لە هۆکارە گرنگەکانی زیادکردنی توانای هزری‌و لاشەیی ئەو کەسانەی کە لە دامەزراوەیەکدا کار دەکەن، لە هەر پلەو ئاستێکی کارکردندا بن، بێگومان ئەوەش راستەوخۆ کاردەکاتە سەر توانای کەسەکان، بۆ زیاتر شارەزا بوون‌و بەرزکردنەوەی ئاستی زانیاری لەسەر کارەکەیی‌و پێشکەشکردنی‌و بەرزکردنەوەی بەرهەم‌و زیادکردنی ئاستی خزمەتگوزاری بە دامەزراوەکە، بۆیە پێویستە لە کاتی راهێناندا رەچاوی ئەم هەنگاوانە بکەین تاکو زیاتر کاریگەری هەبێت:

١- راهێنان بکە بە بەشێك لە پلانی باڵاکردنی وەزیفەدا:

پێویستە هەموو فەرمانبەرێك کە لە کۆمپانیاکەدایە نەخشەو پلانێکی وای هەبێت، بۆ باڵاکردنی پیشەیی پێشخستنی وەزیفی تاکو ئاستی شارەزایی‌و لێهاتوویی کە پێویستە تێیدا دەرکەوێت، کاتێکیش بەرنامەی کاری راهێنان جێبەجێ دەکرێت، کە بەڕێوەبەرەکان رایان سپاردووە، دەبینی ئەو بەڵێنانەی کە دراون بە هەدەر چوون.

٢- پێویستییەکانی راهێنان شیتەڵ بکە:

لە خۆتەوە بابەتەکانی راهێنان هەڵ مەبژێرە، تا دوای ئەوەی سەرجەم بەشداربووان کۆ دەبنەوە لەگەڵ رێبەرەکاندا، تا ئەو ئەرکانەی کە پێویستە دیاری دەکەن، بۆ پەرەپێدانی ئەو کارامەییەی کە تێیاندا دیاری دەکرێت.

٣- هەستە بە دانانی پلانی پەرەپێدان:

فۆرمی هەڵسەنگاندنی ئەدای کار بەکاربهێنە تاکو راوسەرنجی گشت فەرمانبەرەکانت لا روون‌و ئاشکرا بێت، سەبارەت بەو لێهاتوویی‌و شارەزاییانەی کە دەیانەوێ بۆ برەودان‌و گەشەکردن بە کارەکانیان لە رێگای راهێنانەوە ئەوەی لە راپۆرتی فۆرمەکاندا بە دەستی دێنی بیکە بە بەشێك لە پلانەکەت.

٤- بەکارهێنانی باشترین شێوازی وانە وتنەوەی نموونەیی لە لایەن راهێنەرانەوە:

زۆربەی بەرنامەکانی راهێنان پەیوەندیدارن بە کارامەیی پەیوەندیی کارامەیی سەرکردایەتی، هەمان شت لە گشت کۆمپانیاکان بە کاردێت، بەڵام ئەوەی گرنگە لێرەدا رۆڵ ببینێ راهێنەرانە، کە چۆن هەست بە گەیاندنی ئەو چەمکی کارامەیی‌و شارەزاییە بکەن کە بیگەیەنن بە بەرامبەرەکانیان، سەبارەت بە کێشەکان لە چوارچێوەی کارەکانیاندا، راهێنەرانی هۆشیارو زیرەك درکی ئەوە دەکەن، لەبەرئەوە نموونەی راهێنانی چاك دەهێننەوە، کە پەیوەندی بەو بارودخەوە هەبێت کە تێیدا دەژین.

٥- وازیان لێ بێنە ئەوەی فێربوون با جێبەجێی بکەن:

گەر رێگات دا بە فەرمانبەران ئەو چەمکانەی کە وەریان گرتووەو فێری بوون نوێیە، ئەوا ئەوانیش بەزۆریی ئارەزووی جێبەجێکردنی دەکەن.

هۆکارەکانی جێبەجێکردنی ئەوانیش خۆی دەبینێتەوە لە راهێنان‌و لاساییکردنەوەو یاریکردن‌و دەورەکان.

٦- کۆمەك‌و یارمەتییان بکە:

بەشداربووانی خولی راهێنان کۆمەك بکە، بەوەی کە دەتوانن لەگەڵ خۆیان بیبەن، دوای تەواو بوونی خولی راهێنانەکە ئەویش بۆ قوڵ بوونەوە یان لە باش تێگەیشتنی ئەو کارەی کە راهێنانیان لەسەر کردووە، لەو شتانەی کە یارمەتی دەرن، وەك ئامێری تۆمارکردنی دەنگ‌و رەنگ، کتێب‌و ... هتد.

٧- پێشکەشکردنی خول‌و راهێنانی ماوە کورت:

زۆرێك لە کۆمپانیاکان بەڕێوەبەرەکانیان دەنێرن بۆ خولی ماوە درێژو تاقەت پڕوکێن، کە ماوەیەکی زۆر دەخایەنێت، زۆرێك لە بابەتەکانیش تەنها وتاردانن، بۆیە زۆر جار ئەم جۆرە خول‌و راهێنانە هیچ سوودیان

نابێت، تەنها کات بەسەر بردنەو بەس، بۆیە وەك پشوویەك سەیر دەکرێت، لەبەرئەوە باشتر وایە ماوەکەی کورت بێتو بابەتی شیاوو سوود بەخش پێشکەش بکرێت.

٨- وتوێژکردن لە نێوان راهێنەرو راهێنان پێکراو، لە ماوەی خولی راهێناندا:

رێگە بدە بە راهێنراوەکان کە بواری گفتوگۆو موناقەشە کردن بکەن، لەسەر بابەتەکە تاکو راوسەرنجو تێبینی خۆیان بدەن لەسەری، بە تایبەتی لە کاتی پشووەکاندا کە ئەمەش دەبێتە هۆی دروستکردنی تواناو لێهاتووی بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەو کۆسپو ئاستەنگانەی روویان تێ دەکات، لە کاتی ئەدایاندا لە کارەکانیاندا.

٩- بەکارهێنانی سەرجەم ئەو کارە نوێیانەی کە فێربوون لە کاتی راهێناندا:

دوای کۆتایی هاتنی بەرنامەی راهێنان داوا لە بەشداربووان بکە کە نەخشەی کارەکەیان بنووسن کە بە نیازن جێبەجێی بکەن لە کارەکەیاندا، وازیان لێ بێنە دوای سێ مانگ بە یەك بگەنەوەو کۆببنەوە بۆ راگۆڕینەوە سەبارەت بەوەی کە چییان جێبەجێ کردووە لەوەی کە فێری بوون، یان نەخشەی ئەو کارەیان بۆ بنێرەو بیریان بخەرەوە کە پابەند دەبن بەوەی کە فێری بوون لە خولدا.

١٠- کۆبوونەوەیەك ساز بدە لە نێوان راهێنەرو سەرپەرشتیاردا:

باشتر وایە کە راهێنەرەکان لەگەڵ سەرپەرشتیاراندا راستەوخۆ دوای تەواوبوونی خولەکە کۆبوونەوەیەك ببەستن تا لە نێوان خۆیاندا گفتوگۆی تەواو بکەن سەبارەت بە جێبەجێکردنی ئەو زانیاریانەی کە لە خولەکەدا پێشکەش کراوە.

١١- پتەوکردنی پەیوەندی نێوان راهێنراوانو پەیڕەوکردنی سیستەمی گروپ لە کاتی راهێناندا:

راهێنانی ئەندامانی تیمەکە بە کارکردن لەگەڵ یەکتردا بە شێوەیەکی لێزانانەو شتێکی تەواو جیاواز، لەوەی کە هەڵدەستن بە جێبەجێکردنی ئەوەی کە وەریانگرتووە، جا بە یەك گەیشتنی ئەندامانی بەرنامەڕێژی راهێنان لەگەڵ یەکتردا، هەروەها بەستنی پەیوەندی بەهێزو بەرهەمدار لەسەر ئاستی کەسێتیو سەرکردە، بریتییە لە هەستان بە ئەنجامدانی کۆبوونەوە بۆ تیمەکان تاکو گفتوگۆ لەسەر ئەو بابەتانە بکەن، کە لە کۆڕو خولەکاندا ئەنجامدراوە، تا بگەنە ئاستێکی چاکترو باشتر ئەوەش جوانیو رازاوەیی دەگەیەنێ، گەرنا پێچەوانەکەی دەبێتە کۆسپو ئاستەنگ وەك تیمێکی سەرکەوتوو.

# بەفیڕۆ نەدانی کات لە شوێنی کارکردندا

و/ کاوە محەممەد شارباژێڕی

خۆ رزگار کردن لە بابەتە کۆنو بێ سوودەکان:

پێویستە بەر لە هەموو شتێك ئەو کەرەسانە دیاری بکەیت کە شوێنت لێدەگرنو دەبنە بەربەست بۆ راپەڕاندنی کارەکانت، زۆرجار بە هۆی تێپەڕبونی رۆژگارەوە ئەو کەرەسانەت لە دەور کۆدەبنەوە، بەڵام لە ئێستادا هیچ پێویستیت پێیان نەماوە، هەروەها لە راپەڕاندنی کارەکانت هاوکاریت ناکەنو بەختەوەرت ناکەن، بۆ ئەمەش پێویست دەکات بێ لایەنانە بڕیار بدەیت.

ئەم هەنگاوە یارمەتیت دەدات لە فراوان کردنو گەورەکردنی شوێنی کارکردنت، بۆ نموونە وێنەکێشێك بۆی دەرکەوت کە شوێنێکی زۆر گونجاوی پشتگوێ خستووە لە کاتێکدا دەیتوانی سوودی زۆری لێوەربگرێت بۆ فراوانکردنی رووبەری کارەکەی، بێگومان ئەمەش دوای لابردنی کۆمەڵێ گوڵی وشك کە لە ئەو شوێنەدا دانرابوو، جگە لەوەی کە شوێنەکەی گرتبوو هۆکاری کۆبوونەوەی تۆزو پیسی بوو لەو شوێنەدا، کە بۆ ماوەی پێنج ساڵ بەلای کەمەوە لە وێدا بوون.

هەروەها بریکارێکی فرۆشتن شوێنێکی بۆ هەڵواسینی هەندێك وێنەی کوڕەکەی دیاریکرد، لە کاتێکدا لەتەمەنی منداڵیدا لەگەڵ یەکێك لە یانەکان یاری دەکرد.

دوای ئەمە تۆش سەرنجێکی نوسینگەکەت بدەو لەچەند خولەکێکدا ئەم زانیاریانەی خوارەوە پڕ بکەرەوە:

ئەو پێنج شتە چییە کە پشتگوێم خستووەو دەتوانم خۆمی لێ رزگار بکەم؟

* ولیام جیمس دەڵێت «حیکمەت ئەو هونەرەیە فێری زانینی ئەو شتەم دەکات کە پێویستە پشت گوێی بخەم».

دیاریکردنی کەرەسە خراپەکان... دوای ئەوەی بۆت دەردەکەوێت هیچ دوو دڵ مەبە لە لەناوبردنیان!

سەرمێزەکەت پاك بکەرەوە/

بۆ دەست پێکردنی سەرەتایەکی نوێ هەموو شتەکانی سەر مێزەکەت لابەرە، هەموو کاغەزو چەکمەجەی هاتوو و رۆیشتوو کە پەیوەستن بە کارەکانتەوەو هەروەها هەموو ئەو کاغەزانەی کە پەیوەستن بە کاری ئێستاتەوە لابەرە، هەروەها تێبینیە جیاوازەکانو نامە تەلەفۆنییەکانو پۆستەی ئێستاو رۆژمێرەکەتو دەفتەری تێبینیەکانو هەر شتێك کە ببێتە هۆی ئەوەی بە جوانی سەرمێزەکەت نەبینی، هەموو ئەمانە بخەرە ناو پۆستە تایبەتەکەت یان کارتۆنێکەوە.

دەست بە چاکردنی سەرمێزەکەت بکە:

دانانی ئەو شتانەی کە رۆژانە پێویستیت پێی هەیە، رێکخستنیان بە شێوەیەکی جوان بۆئەوەی بۆ داهاتوو زۆرگونجاو بێت، چونکە بوونی مێزێکی پاكورێکوپێك لە بیرکردنەوەی جوانو نایابدا هاوکاریت دەکات، لەبەرئەوە پێویستە ئەم هەلە بەخۆت بدەیت بۆ ئەوەی کاتی زیاترت دەستگیر بێتو جارێکی تر رێکی بخەیتەوە بەم جۆرە:

ئامێری تەلەفۆن (لەسەر مێزەکە بەجۆرێك دابنێ، کە بە ئاسانی دەستت بیگاتێ).

دانانی بزنس کارتی تایبەت بەخۆت، رۆژژمێر، دەفتەری تێبینیەکان.

سەبەتەیەکی بچووك بۆ پێنووسەکان، لاستیك، راستە، قەڵەمدادان، دەرزی دەمبوس، مقەست.

دانانی سەبەتەیەکی سێ قات لەلایەکی مێزەکەوە بۆ رێکخستنی پەڕەکان وەك دانانی هاتوو و رۆیشتوو... هتد.

هەروەها بۆ سوود وەرگرتنی تەواو لە کات پێویستە تەلەفۆنەکانت کورت بێت، ئاگادارکەرەوەیەك یان کاتژمێرێك هەبێت بۆ یادخستنەوەی کارە پێویستەکانت، دانانی بەشێکی مێزەکە بۆ کارە گرنگەکان، ئەوەشت بیرنەچێت کە بەشێکی سەرەکی دابین بکەیت بۆ بەردەستی خۆت کە بەردەوام کارەکانتی لەسەر ئەنجام دەدەیت!

کەڵەکەنەکردنی پرۆژەکان لەسەر یەكو بە یەکەوە لەسەر مێزەکە، بەمجۆرە کارەکانت ئاسانترو بەرهەمت زۆرتر دەبێت.

سەرچاوە: لە یەکێك لە نوسینەکانی (باسل حسون)ە وەرگیراوە.





# ئەنجامی ڕاوێژکردن‌و دەستپاکی

جوانترین چیرۆك

و: محەممەد مێرگەیی

ڕۆژێکیان گەورەی دارستان شێری پاشا، لەگەڵ ئاژەڵاندا کۆبووەوەو پێکەوە ڕێککەوتن لەسەر کۆکردنەوەی پارە بۆ بیناکردنی خانووی نوێ لە پێناو ئەو ئاژەڵە بچووکانەی بە هۆی بارانە زۆرەکەی سەر دارستان خانووەکانیان خاپوورو وێران ببوو.

سەرەتا شێر گوتی: سبەی یەکێکتان بۆ سەرپەرشتی پارەکۆکردنەوە هەڵدەبژێرم.

بۆ ڕۆژی دواتر شێر لەگەڵ مەیمونی ڕاوێژکاری دانیشتو بۆ ڕاوێژێك پرسیاری لێکرد:

من لەم سیانە، کامەیان هەڵبژێرم؟ پڵینگ یان ڕێوی یان ژوشك (ژیشك)، ئایە چۆن بزانم کامیان دەستپاکە؟

مەیمون گوتی: بێگومان دەبێت تاقییان بکەیتەوە.

ئینجا لە شێر نزیك بوویەوە و بە گوێیدا چرپاندی.

دوای کەمێك ڕێوی‌و پڵینگ‌و ژوشك لەوێ ئامادەبوون.

شێر سەرەتا بەخێرهاتنی لێکردن‌و ئینجا کەوتە قسەو گوتی: سێ سندوقی بە تاڵتان لە پێشە، هەر یەکێك لە ئێوە سندوقێك بباتو بچێتە لای مەیمون.

ئەوانیش هەر یەکەو سندوقێکیان هەڵگرتو ڕۆیشتنە لای مەیمون، ئەویش لای دارمۆزەکە چاوەڕێی دەکردن.

مەیمونەکەش بەخێرهاتنی لێکردن‌و گوتی: من لە بەیانییەوە چاوەڕێتان دەکەم.

هەر سێکیان هەر سێ سندوقەکەیان دایە مەیمون‌و ئەویش هەڵیگرتن‌و پێی گوتن:

چاوەڕێکەن، ئێستا هەر یەکەو سندوقەکەتان بە پڕی دەگەڕێننەوە لای شێری گەورەمان، بەڵام دەبێت هەر یەکێك لە ئێوە ڕێگەیەکی جیا بگرێتەبەر.

مەیمون چووە پشتی درەختەکان‌و ونبوو، پاشان دوای پڕکردنی سندوقەکان‌و داخستنیان، هاتەوەو هەر یەکەو سندوقێکی دایەوە دەستیان.

ئیتر هەر یەك لە پڵینگ‌و ڕێوی‌و ژوشك، سندوقێکی هەڵگرتو ڕێگەیەکی جیای بۆ خۆی گرتەبەر.

ڕێوی بە ڕێگەی شاخەکانەوە ڕۆیشت، پڵینگ لە ڕێگەی تاڤگەوەو ژوشکیش بە ڕێگەی ڕووبارەکەوە.

لە ڕێگادا، ڕێوییەکە بە خۆی گوت:

دەبێت ئەم مەیمونە چی کردبێتە سندوقەکەوە؟ دەمەوێت ئەمە بزانم، ڕێوی سندوقەکەی کردەوە، کاتێك بینی پڕیەتی لە توێکڵە لیمۆ حەپەسا.

ڕێوی گوتی: ئایە ئەم مەیمونە گاڵتە بە من یا بە شێری گەورەم دەکات؟!

دەی باشە.. سندوقەکە بۆ شێر دەبەمەوە، ئینجا دەستی کردەوە ڕۆیشتن.

پڵینگیش لە ڕێگادا وەستاو بە خۆی گوت: باشە دەبێت مەیمونەکە چی خستبێتە سندوقەکەوە؟ هەر دەبێ بزانم، سندوقەکەی کردەوەو سەری سوڕما کاتێك بینی سندوقەکە پڕیەتی لە توێکڵە (مانجۆ).

پڵنگەکە گوتی: ئەمە چییە؟ ئایە گاڵتەپێکردنە یان چی؟!

بەڵام دەی.. با بیبەمەوە بۆ شێری گەورەمان، ئینجا ڕێگەکەی خۆی گرتەوە بەر.

وەلێ ژوشك لەبەر گرانی سندوقەکەی ئارەقی لێدەڕژایە بەرپێ‌و لەبەر خۆیەوە دەیگوت:

ئای .. ئەم سندوقە زۆر قورسە، بەڵام هەر دەبێ بیبەم بۆ لای شێری گەورەمان، ئیتر بەردەوام بوو لە ڕۆیشتندا.

ڕێوی‌و پڵینگ بە خێرایی گەڕانەوە لای شێرو کاتێك بینیان وا مەیمونەکەشی لە لایە زۆر سەریان سوڕماو گوتیان: ئۆ ئەوە تۆ لێرەیت؟!

شێر گوتی: گوێ بەمە مەدەن، سندوقەکانتان لەبەردەمم دانێن‌و لێم نزیك ببنەوە.

ڕێوی‌و پڵینگ لە شێرەکە نزیك بوونەوە، شێرەکە دەستی ڕێوی گرتو بۆنی کردو گوتی:

ئاااااه بۆنی لیمۆ چەند خۆشە!

ڕێوییەکە لە شەرمان دەمی کردەوەو سەری نزمکرد.

پاشان شێر دەستی پڵینگی گرتو بۆنی کرد:

ئاااااه بۆنی مانجۆ خۆشتریشە!

زانیاری

# دۆزینەوەی ئەڵقەیەکی نوێ بەدەوری (زوحەل)دا

ئا: خونچاو محەمەد



منداڵان وەك دەزانن هەسارەی (زوحەل) شەشەم هەسارەی کۆمەڵەی خۆرە، خوای گەورە بە شێوەیەك ئەم هەسارەی دروستکردووە کە لە هەموویان جوانترو سەرنجراکێشترە، ئەمەش بە هۆی ئەو ئەڵقانەی بەشێوەی هێڵێك بە دەوریدا سووڕاونەتەوەو وایان لێکردووە لە هەسارەکانی تر جیاوازبێتو ئەم دیمەنە سەرسوڕهێنەرەیان پێ بەخشیوە.

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانی زیاترە ئەوەیە کە بەم دواییانە زانایانی بواری فەلەکناسی ئەڵقەیەکی تری نوێی نەبینراویان بە دەوری هەسارەی (زوحەل)دا دۆزییەوە، هەروەك توێژەران ئاماژەی پێدەکەن، ئەم ئەڵقەیە بە لاری ٢٧ پلە لە ئاستی ئەڵقەی سەرەکی (زوحەل) دایەو دەکەوێتە دووری ٦ ملیۆن کیلۆمەترو بەرینیەکەی ١٢ کیلۆمەتر دەبێت، هەروەها توێژەرانی بەشداربوو لەم دۆزینەوە گرنگەدا دەڵێن: نیوەتیرەی ئەڵقە تازە دۆزراوەکە بە ئەندازەی ٣٠٠ (زوحەل)ی بە تەنیشت یەکەوەبوو دەبێت... لەگەڵ یەك ملیار گۆی زەوی، تا ئێستاش لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی فەلەکی بەردەوامە بۆ دۆزینەوەی زیاتری نهێنییەکانی ئەم هەسارەیەو ئەڵقە سەرسوڕهێنەرەکانی.



سەرچاوە: گۆڤاری (ماجد) ژمارە ١٦١٠ —دیسمبر ٢٠٠٩



پڵینگیش لە شەرماندا دەمی کردەوەو سەری نزمکرد.

دوای کەمێك ژوشکیش گەیشتە ئەوێو لە ماندوویەتیدا دڵی هەر ترپەترپی دەکرد.

شێر گوتی: ڕێگاکە دژواربوو.. وا نییە ژوشك؟ وەلێ قەیناکە، وەرە سندوقەکەت دانێو لێم نزیك بەرەوە.

ژوشك لە شێرەکە نزیك بوویەوەو شێریش دەستی گرتو بۆنی کرد، بەڵام هیچ بۆنێکی لێوە نەهات.

شێرەکە بە ژوشکی گوت:

تۆ لە تاقیکردنەوەکەدا دەرچوویتو سەرکەوتیت، سندوقەکە پڕبوو لە توێکڵی (شەمامە)و منیش هیچ بۆنێك لە دەستت ناکەم. ئەمە مانای وایە تۆ دەستپاك بوویتو سندوقەکەت نەکردۆتەوە، بۆیە منیش بۆ کۆکردنەوەی پارە لە ئاژەڵەکان بۆ بیناکردنی خانووی نوێ هەڵم بژاردیت، سبەینێ وەرە لام تا کلیلی گەنجینەکانت پێ بدەم.

ئینجا شێر بە مەیمونەکەی گوت:

بە ڕاستی مەیمونی ژیر، ڕاوێژەکەت ڕێكو جوان بوو.

سەرچاوە: گۆڤاری (ماجد) ژمارە (١٤٥) ساڵی ٢٠٠٦

ناونیشانی چیرۆکەکە: (مشورە قرد).

# یاسای جێگیر لە بازاڕسازیدا

بەشی یەکەم

٢٢

و. هاژە شێروانی

**١- یاسای پێشەنگیو پێشەوایەتی:** (لە بەرژەوەندی تۆیە کە یەکەم بیت نەوەك باشتر بیت):

* هەڵسان بە بنیاتنانی بەرهەمێك کە تۆ تیایدا یەکەم بیت.

* ئاسانترە بۆت کە یەکەم بیت بە چوونە نێو زەینو ژێری کڕیارەکان بە بەراوورد بە هەوڵدان بە باوەڕ پێ هێنانیان بەوەی کە تۆ بەرهەمێك یا خزمەتێکی باشترت هەیە لە چاو ئەو لایەنەی کە یەکەم جار لەم جۆرەی پێشکەش کردووە.

* ئەو هێماو نیشانانەی کە یەکەم جار دەچنە بازاڕ هەمیشە پارێزگاری دەکەن لەسەر پێشەنگیو پێشەوایەتیان لە بازاڕ، کە ناوەکانیان دەبێتە هاوشێوەی ناونانی ئامێرو بەرهەمەکان وەکو (گسکی کارەبایی هووفر، کاسێتی سۆنیو وکمان،..... هتد).

* بە چاوپۆشین لە جۆرەکەی، خەڵك هەمیشە باوەڕی وایە کە یەکەمجار بەرهەم باشترینو چاکترینیانە.

هەر وەك کە کۆکا کۆلا یەکەم جار خواردنەوەی گازی بوو لە پۆلێن کردنی دەست پێکی لە بازاڕی ئەمریکادا، بۆیە دەبینین کە ئەمڕۆ لە بە ناوبانگترین نیشانە بازرگانییەکانە لە جیهانو هەر ئەوەی کە یەکەمە لە بازاڕی ئەمریکا، ڕکابەری کردنی بیبسی هاتە نێو بازاڕەکانی جیهانی عەرەبی پێش کۆکا کۆلا، هەر بەم هۆیە پشکی بیبسی زۆر زیاترە لە پشکی کۆکا کۆلا لە بازاڕی عەرەبی، بە هۆی یاسای پێشەوایەتیو پێشەنگی.

**٢- یاسای پۆلێن کردن:** (ئەگەر نەتوانی یەکەم بی لە پۆلێن کردن دەست بکە بە پۆلێنێکی نوێو لە هەمان کاتدا تۆ تیایدا یەکەم بیت): لێکۆڵینەوە زانستییەکان دەریان خستووە کە پێویستە لە سەرت کە جیاواز بیت لە کەسانی تر، نەوەك باشتر بیت (هەروەك کە زۆرینە وا دەکەن)، هەر جیاوازییەك گوزارشت لە پۆلێن کردنێکی نوێ دەکات، بۆ هەر پۆلێنێك سەرکردەیەك (پێشەوایەك) هەیە تاوەکو پۆلێنێکی نوێ بنیات بنێی پێویستە کە بەهێزەوە لایەنی جیاوازی بەرهەمە پێشکەش کردووەکەت دەربخەیت، تاوەکو لە زەینی کڕیارەکان ڕوون دەبێتو لە لای ئەو کڕیارانەش پێویستە کە تۆ یەکەم بیت لە ڕیزبەندی.

کارەکەت هەر ئەوە نییە کە تەنها دروستکردنی پۆلێنێك بێت، بەڵکو پێویستە لەسەرت کە پۆلێنێك دروست بکەیت کە قازانجو داهاتت بۆ دەستەبەر بکات.

**٣- یاسای زەین:** (پێویستە لە سەرت یەکەم بیت لە زەینی خەڵك ، لەوەی یەکەم بیت لە بازاڕ):

* یەکەم بیت لە چوونە نێو زەینی خەڵك هەمووشتێکە لە بازاڕسازی.

* زەیین پێشەنگی هەیە لە ڕیزبەندی پێش بازاڕ.

* زۆرتر لە بە هەدەردانی کۆششو دارایی لەم بازاڕسازییەدا بریتییە لە هەوڵی گۆڕینی ئایدیایەك کە لە زەین جێگیر بووە.

* سەرەڕای ئەوە ئەگەر ویستت کە پلەی یەکەمت هەبێت لە زەیندا دەبێ بەشێکی گەورە لە بوودجەی بازاڕسازی خەرج بکرێت بۆ پارێزگاری کردنیش لەم پلەیە لە سەرتە کە بەردەوام بیت لە خەرج کردن، تاوەکو ئاستەم لە لای خەڵك لە بیر بکرێت.

**٤- یاسای پێشبینییەکان (بازاڕسازی شەڕی نێوان بەرهەمەکان نییە بەڵکو بازاڕسازی شەڕی پێشبینییەکانە):**

* هەموو ئەوەی کە هەیە لە جیهانی بازاڕسازییدا هیچ نییە جگە لە بیرو بۆچوونێك لە زەینی کڕیاراندا.

* پێشبینی کردن ڕاستییە، هەموو شتێك جگە لەمە خەیاڵە.

* ئەوەی کە خەڵك لە سەر (مارکە) یەك یا بەرهەمێك دەیزانن هەر ئەوەیە کە دەستنیشانی سەرکەوتنو سەرنەکەوتنی دەکات، خەڵکیش بەوە باوەڕ دەکەن کە دەیانەوێت.

* هەندێك جار باشترین بەرهەم هەرەس دێنێ، چونکە پێشبینییەکانی کڕیاری پڕ نەکردۆتەوە.

* پرۆسە گەلێکی بازاڕسازی سەرنەکەوتنو هی تریش هەن کە سەرناکەون، چونکە وایزانیوە کە شەڕەکەی لە چوارچێوەی جیهانێکی واقیعیو مەنتیقیە.

* بۆ هەر بونەوەرێك لە سەر ڕووی زەوی پێناسەیەکی تایبەتی هەیە بۆ هەردوو وشەی (باشترو چاکتر)و ئەم دوو پێناسەیەش پشت بەستوو نییە بە هیچ واقیعێك یا پرۆگرامێکی ئەکادیمی.

زۆربەی شارەزایانو زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە سیستەمی (لیونکس) باشترە لە (ویندۆز)، بەڵام کڕیاران وایدەبینن کە ویندۆز ئەوەیان بۆ دابین دەکات کە دەیانەوێت، ئاسانتریشە لە کارکردن.

**٥- یاسای تیشك خستنە سەر:** (بەهێزترین بنەما لە بازاڕسازی بوونی وتەیەکی جێگیرە لە زەینی کڕیارە پێشبینی کراوەکان):

* کردنەوەی ڕێگاکان بەرەو زەین بە تیشك خستنە سەر بە ئاگایی لە سەر وشەی (ئایدیا) تەنها بە یەك بنەمایە.

* زۆرترین وشەی کاریگەر ساناترینو ئاسانترینیانە، دەرچووە لە سوودی پۆزەتیفو پەیوەستە بە خزمەت یا جەماوەر یا فرۆشتن،

بەربڵاوە لە نێوان کڕیارەکان (وشەکانی وەکو هەرزانترین، باشترین، بەهێزترین، چاکترین) بە کارمەهێنە، چونکە مانای لە دەست داوە لە ئەنجامی زۆری بەکارهێنانی، کڕیار کە خولەکێکت پێدەدا بۆ شیکردنەوە ئەوەی کە پێی دەفرۆشی (بۆیە ئەو تایبەتمەندییانە کورت بکەرەوە بە دەربڕینی تەنها یەك وشە).

* پووختەی بازاڕسازی بریتییە لە تیشك خستنە سەر یا وردبوونەوە (تاوەکو چوارچێوەی کارەکانت کەمتر بێت، تۆ زیاتر بەهێز دەبیت لە بازاڕ، کە ناتوانیت هیچ بکەیت بە کاری بازاڕسازی هەڵبستیت بۆ هەموو چالاکیەکانت بە تەنها یەك بانگەشە).

* یاسای تیشك خستنە سەر بە واتای تۆش هەر داواکراوی بە درك کردن بەوەی کە پێویستە لە سەرت کە هەندێك شت جێبهێڵی.

بۆ نموونە:

* تۆ کاتێك پرسیاری پۆستەی خێرام لێدەکەیت، پێت دەڵێم (DHL) یان (FedEx)و بە دڵنیاییەوە پێت ناڵێم (ارامکس).

* کاتێك پرسیاری بە ناوبانگترین (مارکە)ی چام لێدەکەیت لە جیهان، پێت دەڵێم (لیپتۆن).

* بە ئاسایشترین ئۆتۆمبێلیش (ڤۆلڤۆیە).

٠٦ یاسای تاگرەوی: (دوو کۆمپانیا ناتوانێت خاوەنی یەك پەیام بێت لە زەینی کڕیاردا):

* ترسناکییەکی گەورەیە کە هەڵگری پەیامێکی بێت کە بۆ ڕکابەرەکانت بگەڕێتەوە.

* ناتوانیت ئایدیایەك بگۆڕیت کە جێگیر بووە لە لای خەڵك.

* یەکەمجار بچۆ نێو زەینی کڕیارو لە دوایدا پارێزگاری لە پێگەکەت بکە.

٠٧ یاسای پایەکانی پلیکانە: (هەڵبژاردنی ستراتیژی بازاڕسازی پەیڕەوکراو دەوەستێتە سەر ئەو پایانەی کە بە کارخراون):-

* لێرەدا پایەیەکی هەڕەمی هەیە لە زەینی کڕیاردا، کە بەکاری دەهێنێت لە کاتی بڕیاردان، هەر پایەیەك لەم پلیکانەیە ناوی (مارکە)یەکی هەلگرتووە.

* ژیری ئەوە هەڵدەبژێرێت کە دەیەوێت، زانیارییەك وەردەگرێت کە بگونجێت لەگەڵ پایەی ئەو (مارکە)یە لە هەر پۆلێنێك ،جگە لەوە کە فەرامۆش دەکرێت.

* پەیوەندییەك لە نێوان پشکت لە بازاڕو ڕێکخستنی پایەی پێشبینیەکان.

* ئاگاداربوون لەوەی کە پرۆگرامی بە بازاڕخستنەکەت مامەڵەیەکی واقیعی بکرێت، لەگەڵ ڕیزبەندیت لەم پایانەدا (لە خۆبایی مەبەو توانای خۆت باش بناسە).

* خەڵك ڕەزامەندە لە سەر شتێك لە زەینیاندا جێگیر بووەو هەر شتێکی کە ڕەت دەکەنەوە کە دژین.

بەرەو پێشکەوتن

بەشی سێیەم



# بەڕێوەبردنی تێچوون لە هەلومەرجی ڕکابەریدا

ئیبراهیم مستەفا خدر/ کۆلێژی پەروەردەی بنیات/ سۆران

پێشکەوتنی خێراو بەرچاوی تەکنەلۆژیا لەگەڵ زۆربوونی ڕکابەری لە بازاڕەکانی جیهان، وای لە بەڕێوەبەری یەکە ئابوورییەکانی وەك بانکەکان کردووە کە خزمەتگوزارییەکی باشتر پێشکەش بە هاوڵاتییانو کڕیارەکان بکەن بە شێوەیەك کە ئەم کارە بە کەمترین تێچوونەوە تەواو بکرێت. چاوەڕوانی خەڵك لە دەسەڵاتو کاربەدەستان وا دەکات کە ڕێکخستن بۆ دڵنیاکردنی بەڕێوەبەران لە زانیارییەکانی ژمێریاری بخرێتە ناو گۆشە نیگایەکی فراوانتر، بۆ دەستەبەر کردنی ئەو زانیارییانە دەبێ سیستەمێکی ژمێریاری لێهاتوومان هەبێت هاوسەنگ لەگەڵ بارودۆخی ڕکابەریو هەلومەرجەکانی ئابووری. زۆربەی کۆمپانیا تایبەتییەکان، لە جیاتی بە کارهێنانی سیستەمی کۆنی دۆزینەوەی تێچوون «سیستەمی بەڕێوەبردنی تێچوون» بەکاردەهێنن. لە سیستەمی بەڕێوەبردنی تێچوون، تێچوونی هەر چالاکییەك پێوانە دەکرێتو ئەو تێچوونانە کە گرنگیان نییە، دیاری دەکرێتو بارودۆخێك دروست دەکرێت بۆ لە ناوبردنی ئەو تێچوونانە.

لێرەدا گرنگیدان بە سیستەمی بەڕێوەبردنی تێچوون ( System Cost Management) وا دەکات بەرهەمو خزمەتگوزاری بە باشترین جۆرو بە چۆنیەتییەکی باشتر بە کەمترین تێچوون بەرهەم بهێنرێتو ڕەوانەی بازاڕ بکرێت، کەواتە لێرە توانای ڕکابەرییەکە تایبەتییەکان (کەرتی تایبەت) زیاتر دەبێت. ئەمەش بەوەی کە کۆمپانیا تایبەتییەکان کرداری بەرهەم هێنانو خستنەڕووی خزمەتگوزاری بە پێی تێچوونەکانی گۆڕاو و جێگیر دەبێت، ئەوەی کە بەرهەم هێنانی شتومەكو خستنەڕووی خزمەتگوزاری بە مەبەستی گەیشتن بە سوودێکی دیاری کراو و پارێزگاری کردن لە پشکەکانی بازاڕ، پرسیارێکە کە بۆ وەڵامدانەوەی پێویستە شێوازەکانی پێوانە کردنی تێچوون بزانین.

زۆربەی یەکە ئابوورییەکان بەرەبەرە دوور دەکەونەوە لە گۆشە نیگای ژمێریاری بەهای مێژوویی و ڕوو لە بەکارهێنانی سیستەمی بەڕێوەبردنی تێچوون دەکەن. ئامانجی سەرەکی لە دروستکردنی ئەم سیستەمە کەمکردنەوەی بەهای کۆتایی خزمەتگوزاری (تێچوونی گۆڕاو و جێگیر)ە بە مەبەستی زیاترکردنی سوودمەندی. ئامانجی گرنگ وەك (قازانج، گەشەکردنی پشکەکانی بازاڕ، سەربەخۆیی دارایی، کەمکردنەوەی بەهای کارەکان، زیاترکردنی بەرهەم هێنان، باشترکردنی چۆنیەتی بەرهەمو خزمەتگوزاری ..... هتد). لە کەرتی تایبەت کە بە شێوەیەکی بەردەوام لە لایەن پسپۆڕو بەڕێوەبەران گرنگی پێ دەدرێت بە شێوەیەك لەگەڵ بەڕێوەبردنی تێچوون پەیوەندیان هەبێت. یەکێك لە هۆکارە نوێیەکان بۆ دەستەبەرکردنی ئامانجی سیستەمی ژمێریاری بەهای کۆتایی شتومەكو خزمەتگوزارییەکان "دۆزینەوەی تێچوون بە پێی چالاکی"یە. ئەو سیستەمە لە ڕێگای پێداچوونەوەی زانیارییەکانی دارایی کۆمپانیاو ناسینەوەی چالاکییە سەرەکیەکانیو دیاریکردنی تێچوونەکانی هەریەك لە چالاکییەکانو دەستنیشان کردنی هۆکارەکانی دروستکردنی تێچوونو هەژمارکردنی تێچوونی کارەکانی پەیوەندیدار بە هەریەك لە بابەتەکانی تێچوونەوە هەڵدەستن بە پێشکەشکردنی زانیاری بە بەڕێوەبەران. لە لایەکی تروە بە پێچەوانەی ڕابردوو کە ژمێریاران تەنها ژمێریاری ژمارەو پارەکان بوون، ئەمڕۆ بەکارنەهێنانی ژمێریاری بەڕێوەبردن لە کەرتە تایبەتیەکان دوورە لە ڕاستی بە شێوەیەك کە دانانو ڕێنمایی کردنی بەڕێوەبەران لە ڕووی تێچوون بە یەکێك لە گرنگترین ئەرکەکانیان لە قەڵەم دەدرێت.

ئامانجی بەڕێوەبردنی تێچوون:

سیستەمی بەڕێوەبردنی تێچوون جۆرە سیستەمێکی پلان دانانو داڕێژراوە کە بۆ دەستەبەر کردنی ئەم ئامانجانەی خوارەوە هەوڵ دەدات:

١- پێوانەکردنی بەهای تەواوکراوی ئەو سەرچاوانە کە لە ڕێگای ئەنجامدانی چالاکیەکانی سەرەکی ئابووری بەکاردەهێنرێت.

٢- ناسینەوەو لابردنی هەندێ لە تێچوونەکان کە بەهای زێدە پێدراو دروست ناکەن.

٣- دیاریکردنی لێهاتوویی و سوودمەندبوون لە چالاکیە سەرەکییەکان لە یەکەکانی ئابووری.

٤- زانینو لێکدانەوەی چالاکییە نوێیەکان بە شێوەیەك کە بتوانێت لە داهاتوو یارمەتی کۆمپانیا بدات·

چونکە ئەرکی بەڕێوەبەر، بەدەستهێنانی دڵنیابوونە لە گەیشتن بە ئامانجە دیاری کراوەکان، لەو هەوڵو کۆششانە دەبێت بە مەبەستی گەیشتن بە ئامانجەکانی سەرەوە، بە شێوەیەکی گشتی بەڕێوەبەران سەرقاڵی چوار چالاکی سەرەکی دەبن:

١- بڕیاردان- ٢- پلان دانان- ٣- ڕابەری چالاکییە کردارییەکان- ٤- کۆنترۆڵ کردن·

بۆ ئەنجامی هەریەك لەم چالاکییانەی سەرەوە، بەڕێوەبەر پێویستی بە زانیاری هەیە، ئەو زانیاریانە دەتوانێت لە سەرچاوە جۆراوجۆرەکان بە دەست بهێنرێت وەك ئابووریناسان، پسپۆڕەکانی دارایی، کارمەندانی بەشی فرۆشیاری، بەرهەم، بازاڕ، خزمەتگوزاریو ژمێریاری·

خستنەڕووی زانیارییەکانی سەرەوەو بەڕێوەبردنی تێچوون بە بێ دانانی سیستەمێکی ژمێریاری بەڕێوەبردن سەرناگرێت، چونکە ئەو سیستەمە دەبێ پەیرەوی لە نوێترین سیستەمو میکانیزم بکات لە رووی دانانو دەرهێنانی زانیاریو لە هەمان کاتدا سوود وەربگرێت لە شێوازە جۆراوجورەکانی ژمێریاری لە ناو کۆمپانیاداو ناتوانین ژمێریاری بەڕێوەبردن وەك گروپێك لە هاوکێشەکانی جێگیر تەماشا بکەین، بەڵکو شێوەکانی ئەو بە مەبەستی گەیشتن بە ئامانجەکانی دامەزراو لە ڕێگای بڕیارەکانی بەڕێوەبەرانو کارمەندان ئەنجام دەدرێت· پێویست بوون بە زانیاری وەك وزەی بەکارهاتوو لە ژمێریاری بەڕێوەبردن بەکاردێت· زانیارییەکانی ژمێریاری بەڕێوەبردن بۆ دوو مەبەستی سەرەکی بەکار دێت: یەکەمیان "ئاسانکاری لە بڕیاردان"· دووەمیان "کاریگەری لە بڕیاردان"· لەگەڵ ڕەچاوکردنی دوو هۆکاری سەرەکی گۆڕانکاری تەکنەلۆژیاو ڕکابەری جیهانی دەتوانین بڵێین: کە کاریگەرییەکی یەکجار زۆری هەبووە لە شێوازی بەڕێوەبردنی کۆمپانیاکانو ئەگەر کۆمپانیایەك یاخود دامەزراوێك خۆی هەماهەنگ نەکات لەگەڵ ئەو دوو هۆکارانەی سەرەوە لە ماوەیەکی درێژخایەن لە ڕکابەرایەتی لەگەڵ کۆمپانیاکانی تر دوور دەکەوێتەوە، کەواتە گرنگیدان بە بەڕێوەبردنی تێچوون بۆ بەدەستهێنانی قازانجو سوودمەندییەکی زیاترو مانەوە لە بازاڕی ڕکابەری زۆر پێویستە· کەواتە بۆ ئەوەی دامەزراو بتوانێت لەو ژینگەیە کار بکاتو بەردەوام بێت لە مانەوەو ڕکابەری کۆمپانیاکانی تر بکات پێویستی بە سیستەمێکی ژمێریاری بەڕێوەبردن هەیەو تێگەیشتن لە چەمکەکانی ئەو بابەتە پێویستی بە ناسینەوەی ڕێکخراو و دامەزراوەو وزەکانی کاریگەری ئەو دەکات·

ئامانجەکانی ژمێریاری بەڕێوەبردن:

١- دابین کردنی زانیارییەکانی پێویست بە بەڕێوەبەران بە مەبەستی بڕیاردانو دارشتنی پرۆگرام·

٢- یارمەتی دانی بەڕێوەبەران لە سەرکردایەتیو کۆنترۆڵ کردنی چالاکییە کردارییەکان·

٣- هاندانی بەڕێوەبەرانو فەرمانبەران بە مەبەستی هەڵسان بە کارەکان لە چوارچێوەی ئامانجەکانی دامەزراو·

٤- هەڵسەنگاندنو پێداچوونەوەی کارەکانی یەکەکانی تری سەر بە ڕێکخراو·

زانیارییەکانی ژمێریاری بەڕێوەبردن بە شێوەیەکی گشتی لە رووی ئەرکەکانەوە سەرنجراکێش دەبێت بۆ نموونە: ئەگەر هاتوو تێچوونەکانی جێگیرو گۆڕاو لە کاتی هەژمارکردنیان لە ڕێگای دەستی بە شێوەیەکی بەرچاو زیاتر بێت لە بودجەی تەرخانکراو، بۆمان دەردەکەوێت کە ئەنجامدانی کارەکان بەم شێوازە کاریگەری باشی نییە بۆ کۆمپانیاو دەبێ بیر لە ڕێگایەکی نوێ بکرێتەوە بۆ جێبەجێ کردنی کارەکان·

لێرەوە دەبینین کە زانیارییەکانی ژمێریاری بەڕێوەبردن یارمەتی بەڕێوەبەران دەدات کە قەبارەو سنووری بڕیارەکان دیاری بکەن، بەم شێوەیە تێچوونەکانی خستنەڕووی خزمەتگوزاری بە هەردوو ڕێگای "دەستی" و "کۆمپیوتەری" هەژمارو بە مەبەستی بڕیاردان دەدرێتە بەڕێوەبەران· ئەم مەبەستە لە لایەك بیر لە ڕابردوو لە لایەکی تر پلان بۆ داهاتوو دادەنێت، ئەوەی کە بەرهەمەکان بە چ نرخێك بخرێتە ناو بازاڕەکانو ڕکابەری کۆمپانیاکانی تر بکاتو لە هەمان کاتدا سوودمەندی هەبێت بۆ کۆمپانیا نیشان دەدات کە ئەو سیستەمە بیر لە داهاتوو دەکات·

جیاوازی سەرەکی لە نێوان کۆمپانیا بەرهەم هێنراوەکانو کۆمپانیا خزمەتگوزارییەکان ئەوەیە کە زۆربەی خزمەتگوزارییەکان هاوکات لەگەڵ بەرهەم هێنان بەکاردەهێنرێت، بە شێوەیەکی کورت مەبەستمان ئەوەیە کە ناتوانرێت خزمەتگوزارییەکان لە کۆگاکان بپارێزرێت، بەڵام زۆربەی ئەو تەکنیکانەی کە بۆ پێوانەکردنی بەهای تەواوکراوو پێوانەکردنی کارەکانی یەکە بەرهەم هێنراوەکان دۆزراوەتەوە بە هەمان شێوە لە بەشە خزمەتگوزارییەکان تاقیکراوەتەوەو سەرکەوتنی بە دەستهێناوە، کەواتە لە ڕێگای گەشەپێدانی شێوەکانی ژمێریاری بەڕێوەبردن دەبێ پێداویستییە جیاوازەکانی بەشەکانی خزمەتگوزاری لەبەر چاو بگیرێت·

سیستەمەکانی زانیاری ژمێریاریو پەیوەندییان لەگەڵ بەڕێوەبردنی تێچوون:

ئەمڕۆ لەگەڵ گۆڕان لە سیستەمی بەرهەم هێنانو خزمەتگوزاری، بەڕێوەبردن گۆڕانی بەرچاوی بەسەر هاتووە بە شێوەیەك کە بە تەنیا ناتوانرێت ناسینەوەی تەواوی هەبێت لە ژینگەی خۆی لە کۆمپانیادا، لەبەرئەوە وا پێویستە کە سیستەمێك پێك بهێنرێت کە یارمەتیو ڕێنمایی بەڕێوەبەران بکات لە ناسینەوەی کێشەکان، ناسینەوەی تەواوی بابەتەکان، پێناسەکردنی شێوازەکانی چارەسەرکردنی، دەستنیشان کردنی باشترین چارەسەرو خستنەڕوویان· ڕۆڵی ژمێریاری بەڕێوەبردن لێرە بریتی دەبێت لە دابین کردنو خستنەڕووی زانیارییەکانی پەیوەندیدار بە مەبەستی یارمەتی دانی بەڕێوەبەران لە کاتی پلان دانان بۆ چالاکیو کارەکان ئینجا کۆنترۆڵ کردنی بەڕێوەبردنو لە کۆتاییدا بڕیاردانی شایستەو گونجاو بۆ دەستەبەرکردنی ئامانجەکانی کۆمپانیا· بەڵام دەبێ ڕەچاوی ئەوەش بکرێت کە دابین کردنی زانیاری بە تەنیا یارمەتی دەر نییە، چونکە ئەو زانیاریانە دەبێ تایبەتمەندیان هەبێت بە شێوەیەك کە بەڕێوەبەر بتوانێت لە هەر کاتێکدا پشت بە زانیارییەکان ببەستێت بە تایبەت لە کاتی گەشەپێدان، کردنەوەی بەشەکانی تر، ئاڵۆزبوونی سیستەمەکانی بەرهەم هێنان، خستنەڕووی خزمەتگوزاریەکان·····هتد، بە یەکەوە بەستنی سیستەمی زانیارییەکانی ژمێریاری لەگەڵ ئامانجەکانو شێوازەکانی بەڕێوەبردنی تێچوون، یارمەتی ڕێکخراوو دامەزراوەکان دەدات بۆ کەمکردنەوەی تێچوونەکانو لە هەمان کاتدا بەرزکردنەوەی سوودمەندیان· هەر بۆیە دەبینین کە زۆربەی ڕێکخراوو کۆمپانیاکان ئەوانەی کە لە نزیکەوە پەیوەندییان هەیە لەگەڵ کڕیارەکانو مەبەستیان سوودی زیاترە، گەیشتوونە ئەو ئەنجامە کە کەمکردنەوەی تێچوونی بەرهەم هێنانو خستنەڕووی خزمەتگوزارییەکان، پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بە زیاترکردنی سوودمەندی·

کەواتە یەکێك لەو ڕێگایانەی کە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی تێچوونەکانی سەرەوە، بەکارنەهێنانی سیستەمەکانی کۆنی ڕابردوو، بەکارهێنانی سیستەمەکانی ئەم سەردەمە· لە دنیای ئەمڕۆ ژمێریارانو پسپۆڕانی سیاسەتەکانی دارایی کۆمپانیانو بە هۆی بەکارهێنانی سیستەمەکانی ژمێریاری بەڕێوەبردنو بەڕێوەبردنی تێچوون ڕۆڵی سەرەکییان دەبێت لە سوودمەندی، لە ڕوویەکی ترەوە ئەمڕۆ چەمکی بازاڕ بە ناوچەو شارێکی دیاریکراو سنووردار ناکرێت، بەڵکو چەمکێکی جیهانییە، ڕکابەرییەکی زۆر بە توانا لە ئاستی نێودەوڵەتی، وا لە زۆربەی کۆمپانیاکان دەکات کە بەرهەمو خزمەتگوزارییەکانی بە باشترین جۆرو چۆنییەتی بە کەمترین تێچوون ڕەوانەی بازاڕەکان بکەن·

بەسوود وەرگرتن لە ئینتەرنێت·




# کچان و کوڕان لە نێوان ئازار و ئاواتدا Hotmail®

# تۆش دەتوانیت داهێنەر بیت!!



خۆشەویستانم هەموو یەکێك لە ئێوە دەتوانێت داهێنەر بێت، چونکە مرۆڤە داهێنەرەکانیش وەکو ئێمە مرۆڤی ئاسایین، بەڵام جیاوازی ئەوان تەنها ئەوەیە کە ئاراستەی تەواوی خۆیان دەزانن‌و ئامانجی خۆیان دیاری کردووە، بۆ گەیشتن بەو ئامانجانەش بە پێی پلانێکی سەرکەوتوو کاری بۆ دەکەن.

یەکێك لەو داهێنەرە گەورانەی کە زۆربەتان داهێنانەکەی دەناسن، وەلێ بە خۆی ئاشنا نین، ئەویش داهێنەری ئیمەیڵی هۆتمێلە (hotmail) کە گەورەترین ئیمەیڵی ئەلیکترۆنییە لە جیهاندا کە ئێستا لە نێو گروپی (مایکرۆسۆفت)دایەو لە ژینگەی ویندۆزدا کار دەکات.

داهێنەری ئەم ئیمەیڵە ئەمریکی نییە، بەڵکو ناوی (صابر بایتایە)و لە ساڵی ١٩٨٨ دوای ئەوەی بە پلەی نایاب لە زانکۆی (ستانفۆرد) زانستەکانی کۆمپیوتەری تەواو کرد لە کۆمپانیایەکی (ئینتەرنێت) وەکو ئەندازیاری پرۆگرامسازی دامەزرا، هاوکات لەگەڵ هاوڕێیەکیدا کە ناوی (جاك سمیث) بوو، لە هەوڵی دروستکردنی کۆمپانیایەکی تایبەت بە خۆیان بوون، بۆ ئەم مەبەستەش لە ڕێگەی بازنەی داخراوی ئەو کۆمپانیایەوە کە کاریان تێدا دەکرد بیروبۆچوونەکانیان ئاڵوگۆڕ دەکرد، خاوەنی کۆمپانیاکە بەم کارە رازی نەبوو کە خزمەتگوزاری کۆمپانیاکە بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان بەکاربێنن.

لەبەرئەوە بە نهێنی ئیمەیڵی گەرماو گەرمی (hotmail)ی داهێناو ساڵی ١٩٩٦ خستییە بازاڕەوە زۆربەخێرایی لە نێوان بەکارهێنەرانی ئینتەرنێتدا بڵاوبووەوە، لەبەر چوار هۆکار:

١- بێ بەرامبەرە.
٢- تاکە کەسییە.
٣- نهێنییە.
٤- دەتوانرێت لە هەموو شوێنێکی ئەم جیهانە بە کار بهێنرێت.

تەنها لە ساڵی یەکەمدا بەشداربووانی لە (١٠) ملیۆن کەس تێپەڕی، ئەمەش وای لە بیل گێتسی خاوەن کۆمپانیای مایکرۆسۆفت کرد کە هەوڵی کڕینی بدات. لە پایزی ١٩٩٧دا (٥٠) ملیۆن دۆلاری پێشکەش بە (صابر) کرد، بەڵام ئەو گرنگی بەرنامەکەی خۆی دەزانی، بۆیە داوای (٥٠٠) ملیۆن دۆلاری کرد دوای مامەڵەیەکی زۆر کە تا ساڵی ١٩٩٨خایاند بە (٤٠٠) ملیۆن دۆلار ڕێکەوتن بەو مەرجەی کەوەکو پسپۆڕێکیش لە کۆمپانیای مایکرۆسفتدا دابمەزرێت.

ئەمرۆ ژمارەی بەشداربووانی (hotmail) (٩٠) ملیۆن کەسەو رۆژانە (٣٠٠٠) کەس لە تێکڕای جیهاندا پەیوەندی پێوە دەکەن.

بەڵام (صابر) هەر بەردەوام بوو لە داهێنانەکانی‌و دوا داهێنانیشی بەرنامەی (ئارزۆ)یە کە ژینگەیەکی ئارام بۆ کڕیارەکانی سەر تۆڕی ئینتەرنێت دەڕەخسێنێت.

(صابر) بەشێوەیەك بوو بە کەسێکی ناودار لە جیهاندا کە هەر یەك لە سەرۆکی پێشووی ئەمریکا (بیل کلینتۆن)و سەرۆکی فەرەنسا (جاك شیراك)و سەرۆك وەزیرانی هیندی بانگهێشتی تایبەتیان کرد.

ئەوەش کە جێگەی سەرنجە لە ژیانی (صابر)دا کە زۆربەی سەروەتو سامانەکەی لە کردنەوەی قوتابخانەو پەیمانگاو یارمەتیدانی خوێندکاراندا بە کاردەهێنێت، بە شێوەیەك کە ڕێژەی سەروەتو سامانەکەی لە (٤٠٠) ملیۆنەوە بۆ (١٠٠) ملیۆن دابەزی!

بەڕاستی ئەم داهێنانە شایانی هەڵوێستەیەو بەو کارەی خزمەتێکی گەورەی بە جیهان کردو وێڕای ئەوەی بەرهەمەکەی بۆ خزمەتی گەل‌و نەتەوەکەی بە کارهێنا.

با ئێمەش بڕیاری هەوڵدان بدەین کێ دەڵێت هەر یەکێك لە ئێمە داهێنەرێکی گەورە نییە؟! بەڵام داهێنەرێکی ونبوو!



# ٤٠ ڕێگە بۆ ئەوەی ئەم ساڵت لە ساڵی ڕابردوو چاکتر بێت!

و/ بەرزان ئالانی

١- ڕۆژانە بە ڕوویەکی خۆشەوە لانی کەم (١٠- ٣٠) خولەك تەرخان بکە بۆ پیادە ڕۆیی؟

٢- ڕۆژانە ماوەی ١٠ خولەك بە بێدەنگی دابنیشە.

٣- لانی کەم لە شەو ڕۆژێکدا ٧ کاتژمێر تەرخان بکە بۆ نووستن.

٤- لە ژینتدا بە سێ شت بژی: (دین، عەقڵ، دڵ).

٥- ڕۆژانە کەمێك لە کاتەکانت لەو یاریانەدا بەسەر بەرە کە دەبێتە هۆی دڵخۆشبوونت.

٦- زیاتر لە ساڵی ڕابردوو بخوێنەرەوە.

٧- کاتێك تایبەت بکە بۆ خواردنی ڕۆحی: (نوێژ، خوێندنی قورئان، یادی پەروەردگار...).

٨- هەندێك لە کاتەکانت لەگەڵ ئەو کەسانە بەسەر بەرە کە تەمەنیان لە ٦٠ ساڵ زیاترە، بەشێکی دیکەی کاتەکانت لەگەڵ ئەو منداڵانەدا بەسەر بەرە کە تەمەنیان لە ٦ ساڵ کەمترە.

٩- لە ماوەی بێداریتدا زیاتر خەون بە شتە واقیعیو چاوەڕوان کراوەکانەوە ببینە.

١٠- زۆر گرنگی بدە بە خواردنی سروشتی، لە خواردەمەنی فوتو خۆت بە دوور بگرە.

١١- ڕۆژانە بڕێکی زۆر ئاو بخۆرەوە.

١٢- هەوڵ بدە لانی کەم ڕۆژانە ٣ کەس دڵخۆش بکەیت.

١٣- کاتە بە نرخەکانت لە زۆر بڵێیدا بەسەر مەبە.

١٤- ناخۆشییەکانی ژیانت لە یاد بکە، هیچ کات هەڵەکانی ڕابردوو بیری هاوسەرەکەت مەهێنەرەوە، چونکە ساتەکانی ئێستات لێ تێك دەدات.

١٥- ڕێگە مەدە بیرۆکە نێگەتیفەکانت بەسەرتدا زاڵ ببن، وزەو تواناکانت بۆ کارە باشەکان پاشەکەوت بکە.

١٦- بزانە کە ژیان قوتابخانەیە، تۆش خوێندکاری لە ناویدا، گرفتەکانت هاوشێوەی هاوکێشە بیرکارییەکانتن، دەگونجێت چارەسەر بکرێن.

١٧- بەیانیان وەکو پاشا نان بخۆ، نیوەڕوان وەکو میر، ئێوارانیش وەکو هەژارێك.

١٨- هەمیشە با ڕووخسارت زەردەخەناوی بێت.

١٩- ڕۆژگارەکانی ژیانت زۆر کەمن، لە کاروباری لاوەکیدا بەسەریان مەبە.

٢٠- پێویست ناکات هەموو کارێك بە جدی وەربگریت.

٢١- پێویست ناکات لە هەموو گفتوگۆو موناقەشەکانتدا سەرکەوتوو بیت.

٢٢- ڕابردوو بە بیرۆکە خراپەکانیەوە لە یاد بکە، تا ئایندەت لێ تێك نەدات.

٢٣- ژیانی خۆت بە کەسانی دی بەراورد مەکە، هەروەها ژیانی هاوسەریشت بە ئافرەتانی دی بەراورد مەکە.

٢٤- تاکە بەرپرس بۆ هێنانەدی بەختەوەریت، تەنها خۆتی.

٢٥- لە هەڵەی هەموو کەس ببورە بەبێ جیاوازی.

٢٦- بیرکردنەوەو تێگەیشتنی کەسانی تر سەبارەت بە تۆ، پەیوەندی بە تۆوە نییە.

٢٧- هەمیشە گومانی باش بەرە بە پەروەردگارت.

٢٨- باروگوزەرانی ژیانت هەر چۆنێکە (باش یان خراپ)، دڵنیابە کە هەمیشەیی نییەو دەگۆڕێت.

٢٩- لە کاتی نەخۆشیتدا کارەکەت چاودێریت ناکات، بەڵکو هاوڕێو دۆستانت چاودێریت دەکەن، کەواتە پێش ئەوەی نەخۆش بکەویت، تۆش چاودێری ئەوان بکە.

٣٠- خۆت ڕزگار بکە لە هەموو ئەو شتانەی کە نە چێژیان لێوەردەگریو نە سوودیان هەیەو نە جوانن.

٣١- ئیرەیی بردن بریتییە لە لەناوچوونی کاتەکانت.

٣٢- هاتنە دی کارە باشەکان ئاستەم نییە.

٣٣- هەستت هەر چۆنێکە لاوازی مەکە، بەڵکو بێدارە بەهێزی بکە.

٣٤- هەمیشە کارە ڕاستەکان ئەنجام بدە.

٣٥- هەموو ڕۆژێك پەیوەندی بکە بە دایكو باوکتو هاوسەرەکەتەوە.

٣٦- هەمیشە گەش بینو بەختیار بە.

٣٧- هەموو ڕۆژێك شتێکی باش ببەخشە بە کەسانی دەوروبەرت.

٣٨- پارێزگاری لە سنووری خۆت بکە.

٣٩- کاتێك بەیانیان لە خەو هەڵدەستیت، ئەوا تۆ لە ژیاندایت، لەسەر ئەو حاڵە سوپاسی پەروەردگارت بکە.

٤٠- هەموو ئەم پەیامانە بنێرە بۆ هەموو ئەو کەسانەی خۆشت دەوێن.

سەرچاوە/ ئینتەرنێت.

# سەرچاوەی مرۆیی و کۆمەڵگای زانیاری

بەشی دووەم

ئا/ وەهاب حەسیب محەمەد

## بەربەستەکانی بەردەم گەشەی مرۆیی:

**١- گەشەی مرۆیی‌و ئاسایشی نەتەوەیی:**

ئاسایشی نەتەوەی ترسێکی دروستکردووە لای زۆربەی حکومەتەکان، بە شێوەیەك هەمیشە لە هەوڵی دانانی پلانی ستراتیژی گونجاودان بۆ پارێزگاریکردنی خۆیان لە ڕێگای دابینکردنی ئاسایشی ئابوری‌و کۆمەڵایەتی لە ناوەوەی وڵات سەرباری تۆکمەکردنی لایەنی سەربازی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسییەکانی دەرەوە (لە دنیای ئەمڕۆدا ئاسایشی نەتەوەیی تەنها لایەنی سەربازی ناگرێتەوە، لایەنەکانی کشتوکاڵ، مەعریفە... هتد، ئاسایشی نەتەوەیی پێکدێنێت. کە بەهۆیانەوە ئاسایشی کۆمەڵایەتی‌و مەدەنی دەستەبەر دەبێت هەروەها لەگەڵ فراوانبونی زانیاری‌و فروانبونی جیهانگیریدا چەمکی ئاسایشی نەتەوەیی فراوانترو هەمە لایەنتربووە، سەرەڕای هێزی سەربازی، مەعریفەو ئامرازەکانی وەك: پەروەردە، زانست... هتد، پایە گرنگەکانی ئاسایشی نەتەوەیی پێکدێنن بە هۆیانەوە حکومەتەکان دەتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن.

بەم شێوەیە واتای ئاسایشی نەتەوەی لە دنیای ئەمڕۆدا فراوان بووە، بە شێوەیەك ئاسایشی ئابوری، کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیری، زانستی، دابینکردنی خۆراك، دەگرێتەوە بە دیوێکی تردا زانستو فێربوون گرنگترین هۆکارن بۆ بەدیهێنانی گەشەی مرۆیی لە ئاستی پێویستدا. ئەگەر پێشکەوتنی ئابوری دەوڵەت هۆکاری جێگیربوونی بازاڕو خۆشگوزەرانی کۆمەڵگا بێت هاوکات یارمەتیدەری ئاسایشی نەتەوەییە بە شێوەیەك دەوری دەبێت لە باشکردنی پەیوەندی پێکهاتەکانی کۆمەڵگادا (پەیوەندی ڕۆشنبیری‌و زانستی)، بەشێوەیەك تاك توانای شیکردنەوەو داهێنانی هەبێت. پەروەردەو فێرکردن هۆکاری داهێنانن، نموونەی ئەمانەش دۆزینەوەی بازاڕی نوێ، دابینکردنی هەلی کاری تازە. لێرەوە پێویستە وەبەرهێنان بکرێت لە بواری پەروەردەو فێربوون، زانست، وەکو هۆکارێك لە بواری گەشەی مرۆیی. هۆیەکی یارمەتیدەری باشی گەشەی مرۆیی دەبێت بە هەموو لق‌و پێکهاتەکانییەوە. هەموو ئەم هۆکارانە لە وڵاتانی تازەپێگەیشتووی وەك چین، هند، مالیزیا، کۆریای باشور، ئیسرائیل کرد، بڕێکی زۆر لە بودجەی ساڵانەیان بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی تەرخان بکەن. بە نموونە ئیسرائیل ٤٫٦٪ لە داهاتی نەتەوەیی تەرخان دەکات بۆ ئەو مەبەستە. بەڵام ئەو وڵاتانەی تائێستا بەشێکی زۆری هاوڵاتیان نەخوێندەوارن، بەکاربەریان زۆرترە لە بەرهەمهێنان، پشکی شێری بودجەیان بۆ کاری سەربازییە، چۆن دەتوانن گەشە بە سەرچاوەی مرۆییان بکەن بە شێوەیەك لە ئاستی پێداویستییەکانی ڕۆژدا بێت؟ بە نموونە وڵاتە عەرەبییەکان ٦٠٪ی بودجەیان بۆکاری سەربازیی تەرخان دەکەن.

**٢- هەژاری‌و دانیشتوانی سەرزەوی:** ئێستا دانیشتوانی گۆی زەوی ٦٫٦ملیار کەس پێکهاتووە، ئەم ژمارەیە پێشبینی دەکرێت ساڵی ٢٠٢٥ بگاتە ١٢ ملیار کەس.

گەرچی لە ماوەی پەنجا ساڵی ڕابردوودا ڕێژەی لە دایکبوون لە ٥٫٤ دابەزیوە بۆ ٢٫١ بۆ هەرخێزانێك، بەڵام ئەم ڕێژەیە لە شوێنێك بۆ شوێنێکی تر جیاوازە.

لە کاتێکدا لە وڵاتە دەوڵەمەندو پێشکەوتووەکاندا نزمە، هاوکات هۆکاری کەمبوونەوەی هێزی کارە لەم وڵاتانەدا، بەڵام لە وڵاتە تازە پێشکەوتوو دواکەوتووەکاندا تەواو پێچەوانەیە، بەرادەیەك حکومەتەکانیان دەستەو وەستانە لە دابینکردنی ژیانێکی ئاسایی بۆ هاوڵاتیان، ئەنجامەکەشی کردنەوەی دەرگای کۆچی نایاساییە بەرەو وڵاتانی ڕۆژئاوا، هەڵاوسانی کێشە ڕامیاری‌و کۆمەڵایەتییەکانە، گەورەبوونی توندڕەوییە کە سەرچاوەی ترس‌و تۆقاندنە بە هەموو شێوەکانیەوە، ئەمەش مایەی نیگەرانی سیستمی ئێستای جیهانە. ساڵی ١٩٥٠ دانیشتوانی باشور دوو بەرامبەری خەڵکی باکوربوون.

ئەم ڕێژە دەگاتە ٨٦٪ ساڵی ٢٠٥٠ لە باشوری گۆی زەوی، ڕێکخراوی (فاوی سەر بە نەتەوەیەکگرتوەکان) پێی وایە تێکچوونی کەشوهەوا هۆکاری تەنگژەی خۆراکە لە جیهاندا کە کاریگەری زیاتر بەسەر وڵاتە هەژارەکانەوە دەردەکەوێت لە ئاسیا، ئەفریقا، ئەمریکای لاتین. بە نموونە نرخی دانەوێڵە (گەنم) لە نێوان ئاداری ٢٠٠٧ بۆ ئاداری ٢٠٠٨ بە ڕێژەی ١٣٠٪، برنج ٧٤٪، گەنمەشامی ٣١٪ بەرزبۆتەوە، ئەمانەش بەرزبوونەوەی نرخی گۆشتو هێلکەو گۆشتی سپی، شیر بەدوای خۆیدا دێنێت.

ڕێکخراوی فاو ساڵی ٢٠٠٨ ئاشکرای کرد ٣٦ وڵات کێشەی خۆراکیان هەیە، ٢١ لەو وڵاتانە لە ئەفریقادان. بە شێوەیەکی تر دەتوانین بڵێین کە (٩٨٠) ملیۆن کەس ڕۆژانە کەمتر لە دۆلارێك داهاتیانە، (٢٫٨) ملیار مرۆڤ دەژین بە کەمتر لە (٢$). هاوکات (٢٫٦) ملیار دانیشتوانی هەسارەی زەوی چاودێری تەندروستی شایەن بە ژیانێکی شایستەیان نییە. ئەمانە هۆکاری گەورەو کاریگەرن لە بەردەم گەشەی مرۆیی‌و دروستکردنی کۆمەڵگای زانیاریدا.

**٣- نەبوونی‌و نەفامی:** ئەگەر هەژاری سەرچاوەی لێکترازانی کۆمەڵایەتی‌و ئاسایشی کۆمەڵگا بێت، ئەوا ژینگەی هەژاری کانگای بزوتنەوە توندڕەوەکانەو یارمەتیدەرێکی باشی نەفامییە. لە نێوانی هەژاری‌و توندڕەویدا پەیوەندییەکی جوتەوانە هەیە کە هەریەکێکیان یارمەتیدەری ئەوی تریانە، بە شێوەیەك گەندەڵی‌و توندڕەویی هەژاری بە گونجاوترین ژینگە دەبینن بۆ گەشەکردن‌و فراوان بوونی خۆیان.

هاوکات نەبوونی هۆیەکی کاریگەری بێ هیوایی‌و تێکشانی مرۆڤەکانە، ئەنجامەکەی: دەرکەوتنی توندڕەوییە لە ژێر ناوی جۆراو جۆری کۆمەڵایەتی، ڕامیاری، ئاینی، ڕۆشنبیری، ئابوری جیاوازدا. بانگخوازانی توندڕەوی خۆیان‌و چالاکییەکانیان بە ئاسانی دەبیندرێن‌و

هەستیان پێ دەکرێن لە ناوچە هەژارنشینەکانو دووره‌ده‌سته‌کاندا، بە نموونە مافیا لە باشوری ئیتالیا دەرکەوتو گەشەی کرد، هەروەها قەراغی شارە پیشەسازیو گەورەکانی دنیا مۆلگای بازرگانی یاساغو شمەکی قەدەغەکراون، هاوکات گۆڕەپانی توندوتیژی جۆراوجۆرن• هەروەها جیهانگیری ئابوریو رۆشنبیری کە بەدوای خۆیدابڵاوبوونەوەی تۆڕەکانی زانیاریو گەیاندنی لێکەوتەوە، دەرکەوتنی کۆمپانیا گەورەکانو یەکگرتنیان، خێرا ئاڵوگۆربوونی سەرمایەو بڵاوبونەوەی وەبەرهێنان لە ناو وڵاتە دەوڵەمەندەکانەوە بۆ وڵاتانی تر، هاوکات سود وەرگرتن لە هێزی کارو دابینکردنی پێداویستییەکانی بازاڕ بە نرخێکی کەم، ئەنجامەکەی دەست بەسەراگرتنی بازاڕ لە لایەکو لە ناوچوونی هەندێك پیشەو ئابوری وڵاتان بوو، کە پشتیان بە هێزی کارو توانای مرۆیی دەبەست•

هەندێك شارەزایان پێیان وایە جیهانگیری ئابوری وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان بێبەش دەکات لە کێبەڕکێ، لە راکێشانی توانای زانستیو هێزی کاری تازەدا، کە لە تواناو شارەزایی نەوەی نوێدا دەردەکەوێت، ئەنجامەکەی کۆچکردنی ئەو تواناو دەست رەنگینانەیە بەرەو وڵاتانی دەوڵەمەند لە باکور•

لەم میانەدا راپۆرتی پەیمانگای (برۆکیگنر)و بنکەی گەشەی جیهانی لە واشنتۆن دەنووسێت: لاوازی بناغەی دەوڵەتو بارودۆخی دەوڵەت راستەوخۆ پەیوەندی بە هەژایو داهاتی تاکەوە هەیە• لە نێوەندی وڵاتە عەرەبییەکاندا، عێراق، یەمەن، فەلەستین• ئەو وڵاتانەن کە هەژاری بە رێژەیەکی بەرزە لە ناویاندا، ئاوی پاكو بڕینی دارستانەکان لە زۆرشوێنی جیهاندا بە شێوەیەك ١٣،٧ملێون هکتارداری سەوز لە دنیادا بڕاون• پێشکەوتنی زانستو تەکنەلۆژیا تیایاندا تۆماردەکرێت ئەمەش بە هۆی جیاوازی زۆری نێوان چینی هەژارو دەوڵەمەند، کەمبوونەوەی چینی مامناوەند بێشك هۆکارەکەی کەمی گەشەوخراپ پیادەکردنی لایەنی ئابورییە لەم وڵاتانەدا، ئەمەش بەربەستێکی تری گەشەی مرۆییە• سەرەڕای ئەم هۆکارانە پیسبوونی ژینگەو کەمبوونەوەی هیچ رێزێکی بۆ ژینگە نەهێشتۆتەوە بەڕادەیەك بووە بە هۆی دەرکەوتنی چەندین دیاردەو هەڕەشەی تازە لە ژینگەو سەرچاوە سروشتیەکانی• پێشبینی دەکرێت لە ماوەی پەنجا ساڵی داهاتودا (٥.٣) پلە گەرمای زەوی بەرزدەبێتەوە ئەمەش واتای زیادبوونی بیابان لەسەرهەسارەی زەوی، لەم ساڵانەی دوایدا بە رێژەی ٣٠٪ غازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن لە بەرگە هەوادا زیادی کردووە•

ئاوی پاکیش بەرێژەی ٢،٢٪ کۆی ئاوی زەوی دەخەملێنرێت ئەمەش رێژەیەکی کەمە لە چاو دانیشتوانی زەوی• ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست جیا لە هەرجێگایەکی تر پێویستی بە ئاوی پاك هەیە، چونکە بەشێکی وڵاتان بۆدابینکردنی ئاوی خواردنەوە پشت بە دڵۆپاندنی ئاو دەبەستن•

# نیسکێك مەکە بە گیسکێك!!

ئامادەکردنی:شاد پێنجوێنی

دەگێڕنەوە جووتیارێك لە زەویو زاری کابرایەکی خانەداندا کاری دەکرد، هەتا بڵێی ماندوونەناس، شەوو رۆژی بۆ خزمەتی زەویو زارەکان خستبووە سەریەك• خانەدانەکە ویستی لە بەرامبەر ئەو هەموو ماندووبوونو تێکۆشانە، کەمێك پاداشتی جووتیارەکە بداتەوە• بۆ ئەم مەبەستە بانگهێشتی کرد تا لە ماڵی خۆیدا میواندارییەکی باشی بۆ بکات، خواردنێکی چەورو بەتامی پێشکەش بکات• پاشان جووتیارەکە بە دەم بانگهێشتی کابرای خانەدانەوە هات• ئەویش پێشوازییەکی گەرمو گوڕی لێکرد، بەرەو ژووری میوان بەڕێی کرد• لەبەرئەوەی جووتیارەکە لە رێوە هاتبوو، شەکەت ببوو، سەرەتا قاپێك ئاوی خستە خزمەتی• کاتێك جووتیارەکە دەستی بە خواردنەوەی ئاوەکە کرد، سەیری کرد تولە مارێك لە ناو قاپەکەدایە• بۆ ئەوەی خانەدانی خانەخوێ تەریق نەبێتەوەو رووگیر نەبێ، ناچار چاوی نووقاندو ئاوەکەی هەڵقوڕاند•

پاش چەند رۆژێك جووتیارەکە هەستی بە ئازارێکی زۆر کرد لە سکیدا، ئازار زۆری بۆ هێنا• ناچار بۆ دەرمانی دەردی خۆی، بەرەو خانەی خانەدانەکە ملی رێی گرتەبەر• ئەمجارەش بە رووخۆشییەوە پێشوازی لێکردو پێکەوە رۆیشتن بۆ ژووری میوان•

خاوەن ماڵ دەرمانی بۆ ئامادەکردو لە قاپێکدا دایە دەستی• هێشتا دەرمانەکەی نەخواردبووەوە، دیسان تولە مارێکی لەناو قاپەکەدا بینییەوە• بڕیاریدا ئەمجارە بێدەنگ نەبێت، هەڵی دایەو بەدەنگێکی بەرزەوە گوتی: جاری پێشوو کە هاتم ئەم تولە مارە نەفرەتییە، ئارامی لەبەر بڕیمو بۆ من بوو بە مایەی ئەم هەموو ئێشو ئازارو دەردو نەخۆشییە• دیسانەوە هەڵی قوڕێنمەوەو قسەش نەکەم؟!

خانەدان پێکەنینی لێ پڕاو دەستی بۆ میچەکە - کە کەوانێکی پێوە هەڵواسرابوو - درێژکردو بە کاکی جووتیاری گوت: دیارە تۆ لە قاپەکەدا وێنەدانەوەی ئەم کەوانە دەبینی نەك تولە مار، راستت دەوێ تولە مارێك لە ئارادا نییە•

جووتیارەکە تەماشای قاپەکەی کردەوە، خەیاڵی ئاسوودە بوو کە ئەوەی پێی بگوترێ تولە مار بوونی نییە، بەڵکو وێنەدانەوەیەکی سادەیەو بەس• پاشان بێ ئەوەی دەرمانەکە بخواتەوە، خانەی خانەدانەکەی بەجێهێشت• رۆژی دواتر چاکبووەوەو هیچ ئازاری نەما•

کاتێك چەند تێڕوانینو بۆچوونێکی سنووردار، لەبارەی خۆمانو دەوروبەرمان پەسەند دەکەین، ئەوا بەخەیاڵ تولە مارێك قوت دەدەینو هەتا لە پێچەوانەکەی دڵنیا نەبینەوە، ئەم تولە مارە هەر بەڕاستەقینەیی دەمێنێتەوە• ئیدی هزری بزر یان زەینی ناوەکی - ئەو ناوچەی مێشکی مرۆڤە کە هەڵدەسێت بە پاراستنی ژمارەیەکی زۆر لە ئەزموونو هەڵوێستو رووداوەکان، هەر لەوێشەوە بیروبۆچوونی ئەو مرۆڤە هەڵدەقوڵێ - دەست بە پەسەندکردنی بیرۆکەکە یان بۆچوونەکە - چ راست بێ یا درۆ - دەکات• تەنانەت وەك موگناتیس دەستدەداتە کێشکردنی ئەو بیرۆکانەی پاڵپشتی ئەم بۆچوونە دەکەن•

گریمان کەسێك لای وایە سازکردنی پەیوەندییەکی پتەو لەگەڵ یەکێکی دیکەدا، کارێکی ئاڵۆزەو زۆریش ئاسان نییە• ئەمە رەگ دادەکوتێ• پاشان ئەم بۆچوونە، بە چەند بیرۆکەیەك کە پشتیوانی لێدەکەن، هزرو هۆشی ئەو ئاودەدات• لەوانە: هەرگیز بەو کەسە ناگەم کە خۆشم دەوێ• پەیداکردنی هاوکارێکی باش کارێکی ئەستەمە••••••هتد• دواتر لە هەڵسوکەوتیدا رەنگدەداتەوەو بەرپەرچی ئەو بۆچوونانەش دەداتەوە کە پێچەوانەی ئەوەی خۆی دەسەلمێنن•

بۆ ئەوەی کەوانێك نەکەیتە تولە مار، نیسکێك نەکەیتە گیسکێك، بەرلەوەی بڕیار لەسەر شتێك بدەیتو لە دڵو دەروونتدا بیچەسپێنیت، زۆر بە وردی لێی بکۆڵەرەوە•




# چەند پێشنیارێك بۆ خۆشەویستبوون

دانا فوئاد

بەردەوام ئەو کەسانە خۆشەویستی خەڵکن کە تواناو لێهاتوویی زۆریان هەیە بۆ پەیوەندییەکی باش لەگەڵ بەرامبەردا.

کارمەندێك کاتێك دەبێتە خۆشەویستی خاوەن کارەکەی کە لە پلەی یەکەمدا بتوانێت لەگەڵ کەسانی دیکەدا خۆی بگونجێنێتو شوێنی کارەکەی پڕکات لە خۆشەویستیو هاوکاری بۆ کەسانی تر.

ئافرەتێك کاتێك دەتوانێت لە نێوان ئەندامانی خێزانیو هاوسەرەکەیدا شایەنی ڕێزلێنان بێت، کە ئەوان هەر بەو شێوەیەی کە هەن قبوڵ بکات. بەردەوام لە هەر ئافرەتێك پرسیار بکرێت باشترین هاوسەر چۆن کەسێکە؟ دەڵێت: "پیاوانی قسە خۆش باشترین هاوسەرەکانن". یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی مرۆڤی تەندروستوسەرکەوتوو ئەوەیە کە پەیوەندییان لەگەڵ کەسانی دیکەدا پەیوەندییەکی تاڕادەیەك هاوڕێیانەیە. کەسی چالاك بەشێکی کەمن لەو کەسانەی کە لەگەڵ هەمووان دۆستن، بەڵام چەند هاوەڵێکی خۆشەویستییان هەیە. ئەگەر دەتەوێت لای خەڵکی خۆشەویست بیت، ئەو کارە لە دەستی خۆتاندایەو پێوستان بە کەمێك تێکۆشان هەیە.

لە سەردەمێکدا کە بە سەردەمی پەیوەندییەکان ناوی لێنراوە یەکەمین هێمای سەرکەوتن دروستکردنی پەیوەندی پێکەوە گونجانە، لەگەڵ دەوروبەردا. ئەگەر بەڕێوەبەرن هیچ کات فەرمان مەکەن بەسەر فەرمانبەرەکانتاندا، بە دەربڕینی وتەکانتان زیاتر دڵسۆزی بۆ کارەکان دەرببڕن، بیرم دێت یەکەمین بنەما لە زانستی راوێژکاریدا فێربووم ئەو مەسەلەیە بوو کە هیچ کات بە ئامۆژگاری فەرمان دەرنەکەم.

بۆیە لێرەوە دەڵێم ئەم ڕستانەی خوارەوە وەك پێشنیار سەیر بکەن:

* گوێگرێکی باش بن، ڕەنگە بڵێن گوێگرتن هیچ نییە، بەڵێ گوێگرتن ئاساییە، بەڵام ئەگەر گوێگر هونەری گوێگرتن نەزانێت باش بەکار بهێنێت پەیوەندی دروستو کاریگەر دروست نابێت، بۆئەوەی خۆشەویستی خەڵك بیت دەبێت هونەری گوێگرتن فێربیت، تاقی بکەنەوەو زۆر بەکاری بهێنن.

* راستگۆبن، بێ پێچو پەنا ڕووبەڕوو راستگۆیانە وتووێژ بکەن، پەیوەندییەك ئەم بنەمایەی تێدا نەبێت بێشك دەپچڕێت.

* هاودڵ بن نەك هاودەرد، هیچ کەس ناڕەحەتیو گرفتی کەسێکی تر بەشێوەی ڕاستی تێناگات، واتە ئێمە ناتوانین هاودەردی بکەین، بەڵام هاودڵی پێشینەیەکە کە تێپەڕبوونی خۆمان دەخەینە شوێنی کەسی بەرامبەرو دونیا لە دیدی ئەواندا دەبینین، لە هاودڵیدا دادوەری قەدەغەیەو ئێمە مافمان نییە لەبارەی کەسانی دیکە دادوەری بکەین مەگەر ئەوەی دادپەروەر یان ماف پەروەر بێت، بەڕاستی هاودڵی بە مانای وەرگرتنی بۆچوونی کەسانی دیکە نییە، بەڵکو بەرادەیەك تێگەیشتنە لە درکو هەستو سۆزی کەسانی تر.

* وشەکانی خۆتان بڵێنەوە، خۆتان بخەنە شوێنی کەسی بەرامبەرو ئەگەر وتەکانتان تاڵ نەبن بە زمان بیڵێن.

* ئامۆژگاری مەکەن، هیچ کەسێك لە ئێمە حەزمان لە ئامۆژگاری نییە، بێ سود خۆتان ماندوو مەکەن، لە جێگای ئامۆژگاری کردن پێشنیار بکەن.

* سەرزەنشت مەکەن هیچ کەسێك بێ عەیب نییە، هیچ گوڵێك بێ دڕك نییە، بەڵام چیتر جێگایەك بۆ سەرزەنشت نامێنێتەوە، سەرزەنشت کردن تەندروستی دەروونی کەسانی دیکە دەخاتە مەترسییەوە، ئەنجامی سەرزەنشت کردن هەستی تاوانو ئازاری ویژدانە کە زۆر زیانمان پێ دەگەیەنێت.

* کەسایەتییەکان چۆنن هەر بەوشێوەیە قبوڵیان بکەن، ئەگەر دەتانەوێ خۆشەویست بن باشترە کەسێك بە هەموو خراپەو چاکەکانییەوە قبوڵ بکەن، قبوڵ کردنیش بێ هیچ بەندو مەرجێك لەبیر مەکەن.

* ڕێزی کەسانی تر بگرن، تا کاتێك ڕێزی کەسانی دیکە نەگرن ڕێزتان لێ ناگیرێت، زۆر جار خەڵك وەڵامی خەڵات کردن بە خەڵات کردن دەدەنەوە، وەڵامی شەق بە تێهەڵدان! بە لەبەرچاو نەگرتنی ئەم خاڵە کە زۆربەی خەڵك هەر وەك ئێمە بیرناکەنەوە، زۆر بنچینەییانە هەستی ڕێزگرتنیان لانییە، بەشێوەی خۆیان سەیری دونیا دەکەن.




ئەی وڵاتە سەر بەتەمو پڕماتەمو گریاوەکەم، هەرێمــی دووکەڵو مژو جێگــەی تەماعی خوێن مژو بە دەســتی دژی بکــوژو داگیرکەرت کەرتو پارچەکراوەکــەم، دایکــە دڵ هەڵقرچاوەکــەی هەردەم ئەســرین لە چاوەکەم٠ ئەی سەدان جار دڵ گوشراو و کوڕ کوژراوو ژاکاوەکەم٠

ئەی وڵاتە بێ خاوەنو بێ پەرژینو بێ ئاڵاکەم، ســینە لەت لەتو واڵاکەم، ئەی نیشتمانی دێرینو هــەردەم لە دڵاشــیرینو نــاز نەدیــوو نازەنینم، باســی چیت کەم، باســی کوێت کەم، باســی کام ئازارو ســوێت کەم، باســی دوژمن یا دۆســتی بۆ دوژمنەکەت نۆکەرو ئەڵقە لە گوێت کەم٠

داســتانی تــۆ چــۆن ئەنووســرێ، چۆن ئەگوتــرێ کاتێ تێیــدا دڵ ئەکوتــرێ٠ زمان چۆنی دەرئەبڕێ کە ئەو جەرگو دڵ ئەبڕێ٠

هــەزاران جــار ڕۆحی لــەدار دراوی تۆ، کەژو کێوی سووتاوی تۆ، دێهاتی خاپورکراو و دانیشتووی لێ دەرنراو و شاری ساراو خنکاوی تۆ٠ بوونە چیرۆکی پڕشۆکی بەخوێنو خەم نوسراوی تۆ٠

تۆ لە هەموو وڵاتێکی ئەم سەرزەمینە بەرینە باشترو چاکتر ئەزانی ئازار چییە! پەتو قەنارەو دار چییــە، قڕانی گوندو شــار چییە، دەردو دادو هاوار چییە، زیانی ژانی بێ چار چییە٠

تۆ جەســتەی لە خاچ دراو و چوار پەلو پارچەکــراو و خاوەنی ســەدان جــێ ژووانی چۆڵو بێ کەسو ســووتاوی٠ مەگەر تەنها تۆ بزانی مەرگو مەینەتی میللەتێ٠ چۆنە برکی درکو داڵی ئاخو ئازارو حەسرەتێ کەوا قەومێ لێی ئەقەومێ٠ کوردستانم لانەی شێرانو وڵاتی دلێــرانو بوێرانــم، دایکی کوڕانی شــەهیدی جــل بەخوێنــم، کیژی ماتو مــل بە کوێنم٠ تــۆوی هەر گوڵاڵەی نواڵــەو لا پاڵێکت قەترە خوێنی لاوێکی بێ ســەرو شوێنی٠ تێکۆشەری تۆڵەسێنی، دوژمنی دڵ ڕەق بەزێنە٠

تۆ خەمخانــەو ماتەمینگای دایکانی ماتو ڕەشپۆشی، هەردەم کۆرپەی خەم لە کۆشی، لە باوەشی دایکانەی بە سۆزی تۆدا لە ناو لانکەی ڕاژەنــداو بــە گەردەلولو تۆزی تــۆدا٠ لە ناو خەزانی پایزو ســەوزایی نەورۆزی تۆدا، تەنها ڕۆڵەی بێنازو بەگاز خنکاو، بە دڵی پڕ لە نیازو ڕاز خنکاو و ئاوارەو تەرەو تاڵانو دەرکراوو لە ماڵی خۆدەرنــراو و خاوەنی چەندەها حەزوو ئاواتی ژێر گڵ خراوو بێ ناو هەیە٠

کوردستانم ســتەمکاران دڵی تۆیان کردە گۆڕســتانی تاروو ئارامــگای ڕۆڵەکانی خۆت٠ لەنــاو دڵتا قەتیس مــاوە دووکەڵی جەخارو بۆســۆت تــۆ بەدرێژایــی مێــژوو گۆڕەپانی تێکرژانو بەرووی یەکا هەڵپڕژانی دەسەڵاتی زل هێــزان بووی٠ گــوڵو باخــی داخ کراوو توشــبوو بــە گەڵارێزانــی بێرێــزان بووی٠ هەزاران جار سمی ئەسپیان دڵی سمی٠

کوردســتانم دوژمنانت کۆنو ئێســتا لە کەمیندان لە پیلانی ڕقو قیندان، بۆ ئەوەی ماڵی دڵی تۆ هەردەم هەر ببێتە زیندان٠

بەڵام تۆ خەفەت مەچێژە، وەك من فرمێسك مەرێژە٠ ڕۆژێك دەبێ ئەم خاکەی تۆ ئەم دەڤەرە بەفــەڕو پیــتو پاکەی تــۆ، خۆری ئــازادی لێ هەڵبــێو لێ ئاوابێ، ماڵەکەی دڵت ئاوابێ، دەوای برینو ناسۆرت، داوای ڕەوای جۆراو جۆرت، وەك بۆ گەلانی تر چۆنە، بۆ تۆش وابێ٠

## وانەیەك بۆ ژیان

**لێدانە بەهێزەکان شوشە دەشکێنێت، بەڵام ئاسن پتەوتر دەکات!**




بەختەوەری شتێکی مەعنەوییە (واتاییە) بە چـاو نابینرێتو بە پارەو پـولو ئاڵتون ناکڕدرێـت، لـە نـاخو قوڵایـی مرۆڤـەوە سـەرچاوە دەگرێت، مرۆڤی ژیرو هەسـتیار نرخی دەزانێت، ئەمە بە هیچ شـێوەیەك لە دەرەوەی مرۆڤ نییە پەیوەندی بەکەسـەوە نییە، یەکێکە لە بەهرەی خودایی هەرکەسێك بیەوێت دەتوانێت بەدەستی بێنێت.

لێـرەدا چەنـد بـاسو بابەتێکـی نهێنی بەختـەوەری دەخەینـە روو، بەڕاسـتی نهێنی کامەرانیو بەختەوەری ئەوەیە کە وا لە مرۆڤ بکات چێژ لە ژیان ببینێ، با دووچاری ناخۆشیو ئاستەنگیش بێت بەرامبەری دەوەستێت.

ئەوە ئەو نهێنییەیە کە زانا (ئیبن قەییم) ئاشکرای کردووەو دەڵێت: (لە دڵدا شپرزەییو ئاڵۆزییـەك هەیە هیچ شـتێك ناتوانێت کۆی بکاتـەوە تەنها روو کردنـە لای خوای گەورە نەبێت، لە دڵدا نامۆییەك هەییە هیچ کەسو شـتێك نییە لای ببات تەنهـا رووکردنە لای خوای گەورە نەبێت. هەروەها بە ئاشـناییو پەیوەندی کردنەوە بە خوای گەورە چارەسەر دەبێت، هەر لە ناو دڵاندا... هەیە، پەژارەیەك هەیە هیچ شـتێ ناتوانێ لایبدا مەگەر شادی کامەرانـیو بەختـەوەری بە ناسـینی خودا نەبێت، ئەو شـڵەژانو دڵـە راوکێیە تەنها بە خۆدانە دەسـت خودا ناخۆشی لەناو دەچنو ئارامی جێی دەگرێتەوە.

ئەگـەر هەموو دونیاو چیشـی لەناویدایە بدرێت بەو کەسانەی کە خاوەنی ئەو دڵە دوورە بێت لە خـودای گەورە هەمـوو دەرمانەکانی دونیای بدرێتێ بۆ ئەوەی خۆی پێ چارەسـەر بکات تێر نابێت، لەو هەژاریانەی دەرناهێنێت هەتـا هەتایە مـادام لـە نێوان ئـەمو خوای گـەورە...، ئەوە ئـەو پەیوەندییە خوداییەیە کـە لـە نێـوان بەنـدەو پەروەردگاردایە کە بەسـتنەوەو گرێدانی زەوی بە ئاسـمانەوە کە وا لـە مرۆڤ دەکات هەر دەم بە بەختەوەریو کامەرانی بژیو دڵنیا بێتو ئۆقرە بگرێ.

ئـەوە ئـەو نهێنییەیـە کەوای لـە زانای بەناوبانگی ئیسـلام کرد (ئەحمـەدی کوڕی حەنبـەل) کـە بە درێژایی سـەدەها سـاڵ باسـی لێوە دەکەن، کە لـە کاتی خۆیدا زۆر بەختـەوەرو کامەران بـووە، دڵنیابوو لەوەی کە لە لای خودای گەورە هێشـتا زۆر زیاترو گەورەتـرو فراوانتـرە لە کاتێکدا پۆشـاكو جـلو بەرگی کۆنو شـڕی دەپۆشـی، تەنها هەمـوو موڵـكو سـامانی سـێ ژووری گڵی هەبـووە تیایدا گوزەراوە خۆیوماڵو منداڵی خۆراکی رۆژانەی تەنها زەیتو لێوارەکانی نان بووە، پێڵاوەکانی پێی زیاتر لە چەند سـاڵی خایاندووە هەر دڕاوەو دوریویەتیەوە.

ئەگەر بە پێوانەی ئەمڕۆ بێت ئەم پیاوە دەبێت رەنجەڕۆو خەفەتبار بێت، بەڵام خەڵکی نازانن بەختـەوەریو کامەرانی لـە ناوەوەی مـرۆڤ هەڵدەقوڵـێ، هیچ کەس هەسـت بەو خۆشییە ناکات تەنها خاوەنەکەی نەبێت.

چونکـە بەڕاسـتی لە ناو قوڵایـیو ناخیدا پەیوەنـدی بەخـودای گەورەوە هەیـە، ئەویش بریتییە لەو رۆحەی کە ژیان بەجموجۆڵ دەخات، ئەو رووناکیەیە کە دەبێتە مەشـخەڵ بۆ مرۆڤ، رێگەو شەوەزەنگی تاریکی پێ رووناك دەبێتەوە، ئەمـەش خۆی بۆ خۆی ئەو نهێنییەیە کە مرۆڤ هان دەدات بۆ دروستکردنی سەرکەوتن...

پێغەمبـەر(د.خ) دەفەرموێـت: (ئەگـەر خودای گەورە بەندەیەکی خۆشویسـت بانگی (جبریل) دەکات، کە خودای گەورە فلان کەسی خۆش دەوێت تۆش خۆشـت بووێت، ئەویش ئەو کەسـەی خـۆش دەوێت، پاشـان جبریل بانگ دەکات لە ئاسماندا کەخودای گەورە فلان کەسی خۆش دەوێت، ئێوەش خۆشتان بووێت، ئەوانیش خۆشەویستیان بۆ دروست دەبێت، لە پاشانیشدا فریشتەی ئاسمانەکان ئەو دەنگۆیە بەسەر خەڵکی زەویدا بەشێوازێکی مەعنەوی پەخش دەکەنو ئەو کەسـە پەسەند دەبێتو خۆشەویست دەبێت لای خەڵکی)).

لێرەداو لەم باسە گرنگە کە سەرجەم مرۆڤ خواستو ئاواتیەتی حەزدەکەم بۆ رێگە رۆشنی زیاتر چەند خاڵێك بخەمە روو کە لەوانە:

١- کلیلی بەختەوەری:

کلیلـی بەختەوەری لـە دونیـاو دوا رۆژدا لەخـوا ترسـانە، دەبێت ئێمە لەهـەر کوێ بین خـودای گەورە بـە چاودێری خۆمـان بزانین. هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت:

(ولقد وصينا الذيـن أوتوا الكتاب من قبلكم وإياكم أن تقوا الله)) (النساء: ١٣١).

واتە: (بەڕاستی ئێمە وەسیەتمان کردووە بەو کەسانەی کە پێش ئێوە پەرتووكو پەیامبەرمان بـۆ نـاردوون، کە لە خودا ترسـیان هەبێت، بە هەمان شێوە هەمان داواکاری لە ئێوەش دەکرێت لە خودا بترسـنو ئەو کەسانەش دوای ئێوە دێن تا دوارۆژ هەر لە خودا بترسن)).

لەم ئایەتەدا تێ دەگەین کەلەو رۆژەی ژیان دروسـت بووە تا ئەو رۆژەی کـە ژیان نامێنێت لەسـەر ئـەم زەوییـە، هیـچ شـتێك گونجاوو کۆکـراوەو گەورەترو بە پاداشـت ترو بەرێزترو لە پێشترو سەرکەوتووتر نییە، بۆ سەر فرازیو بەختـەوەری مرۆڤ وەك ئەم پێ سـپاردەیە کە لە خودا ترسـینە، ئەگەر لەم رەوشـتە بەرزترو بەنرختر هەبوایە خـودا ئامۆژگاری بەندەکانی خۆیو کەسـە تایبەتیەکانی خۆی دەکرد، کاتێك کە خودا ئەم تەنها خووە ئامۆژگاریی داوا دەکات لە هەموو کەسـانی پێشترو کەسـانی دواتریش تەنها ئەمەی دیاریکرد، بۆمان دەردەکەوێت ئەمە تەنها مەبەسـتێکە کە هیچ لادانێـك رەوا نییە لێی، کەسـیش نییە پێویستی پێی نەبێت، بۆیە خـودای گەورە هەمـوو ئامۆژگارییەکانی لێرەدا کۆکردنەوە، هەموو داتاو رێنمونیو مەبەستەکانی تیـادا جێگە بۆتەوە، هەموو رێگـەو فێرکردنو پوختەکردنێکی چاکەی کۆکردووەتەوە.

٢- پەیوەنـدی نهێنییـەکان بـە باسـی بەختەوەرییەوە:

نهێنییـەکان پەیوەندییەکـی بەهێزیان بـە باسـی بەختەوەرییـەوە هەیـە. نهێنی ئەوەیە کە هیچ کەسـێك نهێنییەکانی خۆی بـاس نـەکات لای هەمـوو کـەس بەتایبەت ئەو کەسـانەی کە هەسـت دەکات خۆشـیان ناوێـت، یا لە پێنـاو بەرژەوەندی ئەو بڕیار نادەن، زۆرجار درکاندنی نهێنی دەبێتە هۆی پەشـیمان بوونەوەو خەمو پەژارەو پەرۆشی بەدوایدا دێت، هەروەك پێشـەوا عەلی رەزای خـوای لێبێت دەڵێت: (تا ئەو کاتەی قسـەت نەدرکاندووە دیلی تۆیە!! بەڵام قسەت درکاند ئەو کات تۆ دەبیتە دیلی قسەکەت)).

خوێنەری خۆشەویست بیرت نەچێت ئامانجی ئێمە دوورخستنەوەتە لە خەمو پەژارە.

هـەر لـەم باسـەدا بـە گرنگـی دەزانم بـەدوای دۆزینـەوەی ونبووەکانـدا بگەڕێن، کـە تەنها ونبوونە تینوی دۆزینەوەیە، تەنها نائاسوودەیی تینووی ئاسوودەییە، پێ دەچێت تۆ کەسێکی سـاغو تەندروست بیت، کەسێك

# ٧٠

# ساڵی تەمەن

و/ ڕۆشنا هاشم محمد
هەولێر

ئەگەر خودا ٧٠ ساڵی تەمەن پێبەخشی، چۆن بەسەری دەبەیت؟

٢٤ ساڵ خەوتن.
١٤ ساڵ کار کردن.
٨ ساڵ یاری کردن.
٦ ساڵ نان خواردن.
٥ ساڵ لە هاتووچۆ.
٤ ساڵ قسە کردن.
٣ ساڵ بۆ فێربوونی زانست.
٣ ساڵ لە خوێندنەوەی پەرتووکو ڕۆژنامە.
٣ ساڵ لە تەماشاکردنی تەلەفزیۆن.

بەڵام نوێژ کردن ڕۆژی ٥ جار، تەنها ٨ مانگی پێویستە لە هەموو ژیاندا.
ئایا بەلاتەوە زۆرە تەنها ٨ مانگ لە ژیانی خۆت ببەخشی بە دروستکەری خۆت لە کۆی (٨٤٠) مانگ ئەگەر تەمەنت ٧٠ ساڵ بووە؟!

IF ALLAH (GOD) GRANTS YOU TO LIVE 70 YEARS. You would spend :

24 Years sleeping

14 Years working

8 Years in Playing

6 Years at the dinner table

5 Years in transportation

4 Years in conversation

3 Years in education!

3 Years reading

3 Years watching television

- If you pray 5 Times a day, you would be giving About 8 months of your life only. Can>t we give 8 months out of 70 years (840 Months) to our creator!

- Thats all you need to do is to give8 months of our lives! To Pray and Thank ALLAH (the creator)! And ask him for Forgiveness and Mercy.

# بەختەوەری!

ئا: نێرگز أحمد/ ڕانیە

بزانیت بۆ کوێ دەچیت، دەتوانی چاوەڕوانی چی بکەیت، دەرئەنجامیش بە کوێ دەگەیت، بەڵام ئەمە هەر خۆی بە ئەنجام ناگات، بەڵکو تێڕوانینی وردو شارەزا بوونی دەوێت دەبێت دوورە پەرێزبیت لە نەشارەزایی.

ئەلبێرت ئەنشتاین، زانایەك بووە هەموو تەمەنی لەناو شتە ونبووەکان بەسەربردووە، لە کاتێکدا ئەگەر سەبارەت بە ژیانی خودی خۆی بپرسین دڵنیاین لەوەی کە زۆر بەختەوەر بووە، بێگومان بەختەوەری لە شتە دیارو ماددیەکاندا نییە، ئێمە ناتوانین لە جیهانی ماددی بەرجەستەی بکەین، بەڵکو بە هەوڵ دانو بیرکردنەوەو گەڕانە بەدوای ونبووەکاندا، بەڵام ئێمە وا دەزانین ژیان هەر هێندەیە بە خاترجەمی کاربکەینو ئەنجامی کارەکانمان چییەو بە کوێ دەگەین؟ دۆزینەوەی نهێنییە ونبووەکان دەخەینە ئەستۆی کەسانی تایبەتەوە لە کاتێکدا پێویستییەکی گرنگن بۆ هەر تاکێك لە ئێمە، هەروەها هەریەکێ لە ئێمە تایبەتینو ئەوە تێڕوانینی هەڵەی خۆمانە مرۆڤەکان دەخەینە پۆلێن کردنەوە، هەندێکیان دەکەینە گشتیو هەندێك دەبنە تایبەتی.

با هەریەکێ لە ئێمە لە خۆی بپرسێ کە ئایا ئەو کەسانەی ئێمە خستمانانە چوارچێوەیەکی تایبەتییەوە هیچ شتێکی لە ئێمە زیاترە؟ وەڵامەکەی زۆر ساناو سادەیە، جیاوازییە تایبەتمەندییەکە تەنها هەوڵو کۆششی زیاترەو هیچی تر.

# جوانی ژیان لەناخی خۆمانەوە دەست پێدەکات با بۆ ژیان پێبکەنین

و: عوسمان سەنگاوی

کاتێك بیر لەوە دەكەیتەوە كە ژیان سەختە، جارێكی تریش بیر بكەرەوە!

ئەم ڕووداوە گرنگە پێشكەشە بەو كەسەی كە:

* دەیەوێت واز لەجگەرە كێشانو مادە هۆشبەرەكان بهێنێت، بەڵام دەڵێت ناتوانم.

* دەیەوێت لە فێڵو گزیكاری دوور بكەوێتەوە، بەڵام دەڵێت ناتوانم.

* دەیەوێت واز لەگوناهو تاوانو سەرپێچی بهێنێت، بەڵام دەڵێت ناتوانم.

* دەیەوێت لەكارو خوێندندا سەربكەوێت، بەڵام دەڵێت ناتوانم.

* دەیەوێتو دەیەوێتو دەیەوێت... بەڵام دەڵێت ناتوانم ناتوانم..

ئەمە چیرۆكی ئەو هاوڵاتییە كە لە دایكبووە كەسێكی نائاسایی بووە، بەوەی كە هەردوو دەستو هەردوو قاچی نەبووە!

(نیك فۆجسیس) ئێستا تەمەنی بیستو سێ ساڵەو قۆناغەكانی خوێندنی تا قۆناغی خوێندنی زانكۆ بەسەركەوتووی تەواو كردووەو دەرچووی بەشی كارگێڕی ژمێریاریو ئامارە.

(نیك فۆجسیس) دەڵێت:

كاتێك لەدایك بووم بەو جۆرەی كە خاوەنی دەستو قاچ نەبووم، سەرجەم پزیشكەكان لەم حاڵەتە سەرسام بوونو هیچ جۆرە لێكدانەوەیەكیان نەبوو بۆ شێوەی لەدایك بوونی من! سەرەتا دووچاری چەندین ڕووبەڕووبوونەوەی دژوارو ناخۆش بوومەوە، چونكە وادەزانم من یەكەمین كەسم بەو جۆرە لە دایك بووبێتم، دایكو باوكیشم چاوەڕوانی ئەوەیان نەدەكرد منداڵێكیان بەو جۆرە ببێت، چونكە پێشتر خوشكو برایەكم وەكو دوو منداڵی ئاسایی لە دایك بوون، تەنانەت پزیشكەكانیش لەبەرامبەر ئەم بارودۆخەی مندا بێ وەڵام مانەوە!!

ناوبراو دەڵێت:





# بۆئەوەی بڕیار بگاتە دەستی هەموو کوردێك

خوێنەرانی ئازیز، دۆستانی هەمیشەیی بڕیار، دەزانین ئێوەی بەڕێز چەندە پەرۆشی گۆڤارە خۆشەویستەکەتانن، هەروەکو چۆن خۆتان سودمەند بوون لە کانیاوی پڕزانستو ماریفەتی بڕیار بە ئاواتەوەین هەموو کوردێکی پێ بەهرەمەند بێت، بۆ ئەم مەبەستەش ئێوەی بەڕێز بانگێشە دەکەین کە هەموو پێکەوە هەوڵی گەیاندنی پەیامی بڕیار بدەین، بێگومان بۆ بەدیهاتنی خەوە جوانەکانو ئاواتە بەرزەکانە هەوڵدانو تێکۆشانو ماندووبوونی دەوێت، ئەو کارەش دەبێت ئێوەی دڵسۆز پێی هەڵسن.

جائەگەر دەتەوێت بڕیار بگاتە هەموو بەشێکی ئەم وڵاتەو لە هەموو دامو دەزگاو قوتابخانەو زانکۆکاندا رابەری نەوەی نوێو پەیامبەری پێشکەوتنو گەشە پێدانو داهێنان بێت، با مانگانە چەند ژمارەیەک لە بڕیار بکەین بە دیاری.

ئێمەش لەگەڵ هەموو (٥) ژمارەدا ژمارەیەک دەکەینە دیاری، کەواتە ئەو خوێنەرەی (٥) ژمارە لە بڕیار دەکڕێت بۆ دیاری، ئێمەش ژمارەیەکی دەکەینە دیاری.

بێگومان سەرف کردنی هەر بڕە پارەیەک لە پێناو گەشە پێدانو وەبەرهێنانی تواناکاندا قازانجی بۆ گەلو وڵاتو نەتەوە دەگەڕێتەوە. هەر سەرکەتووبن.



ئەم حاڵەتەی من هیچ پەیوەست نییە بە بەختو هەلو خراپەکاریو ئەو شتانەی کە لە ناو کەسانێکدا بەربڵاوە، چونکە من گەیشتمە ئەو بڕوایەی کە پەروەرگار رێگە نادات بە هیچ شتێك بە سەرماندا بێت تەنها ئەو شتانە نەبێت کە چاکو باشن بۆ ئێمە.

من بەو جۆرەی کە دەبینرێم توانیومە واتایەکی تر بە ژیان ببەخشم، ئەوەش نەك تەنها بۆ خۆم، بەڵکو بۆ کەسانی تریش، لە ئێستادا وەکو وانەبێژێك دەچمە ناو قوتابیانەوەو حەز بە تێکەڵاوی خەڵکی دەکەمو هانیان دەدەم بۆ هەوڵدانو وەلانانی تەممەڵیو رەشبینی، هاوکات وەکو وتەبێژی کەرتی کۆمپانیاکانم، هەروەها چەند کتێبێکیشم بە چاپ گەیاندووە کە پڕفرۆشترین کتێب بوون، راپۆرتێکیشم ئامادەیە کە هەرلە ئەمساڵدا تەواو دەبێتو یەکێکە لە خەونەکانم.

(نیك فۆجسیس) لەبارەی تێڕوانینی خەڵکییەوە دەڵێت:

کەسانێك پێم دەڵێن: بێ قاچ، بێ باڵ، بێ گرفت! چەند دەستەواژەیەکی تر، من لەو بڕوایەدام هەرکەسێك بیەوێت کارێك بکات ئەگەر ویستی خوای لەسەر بێت ئەو کەسە ئەو کارە ئەنجام دەدات، ئیتر گرنگ نییە ئەو کەسە چۆنە، ئێمەش وەکو مرۆڤ بەردەوام خۆمان کۆتو بەند لەسەر خۆمان دادەنێین بەبێ هیچ هۆکارێك! ئەوەش دەبێتە مایەی ئەوەی کە هەوڵ نەدەینو کارەکان بۆ کەسانی تر بەجێ بهێڵین.

ئەوە چیرۆکی کەسێکە کە دەگونجێت کەسێکی (مشرك) بێت بەخوای گەورە، ئەی ئێمەی خاوەن پەیام دەبێت چۆن لە ژیان بڕوانین؟ کە بڕوامان بەوە هەیە کە خاوەنی پەروەردگارێکی زۆر زاناو داناو بە توانابن، پەیامبەریش درودی خوای لەسەر فەرمانمان پێ دەکات کە (استعن بالله ولا تعجز) پشت بەخوا ببەستینو لاواز نەبین.

چەندین ئایەتو فەرموودەش هەیە کە هانمان دەدات لە بەرامبەر ئەستەنگەکانی ژیاندا نەڕوخێینو بۆ ژیان پێبکەنینو هەمیشە لە هەوڵدا بین لەوانەش:

(إن الله لا يغير ما بقوم حتى يغيروا ما بأنفسهم).
(ليبلوكم ايكم أحسن عملا).
(نعمتان مغبون فيهما كثير من الناس الصحة والفراغ).
(وقل اعملوا فسيرى الله عملكم ورسوله والمؤمنون)
(وان ليس للانسان الا ما سعى)

هەستەو بە ورە بەرزییەوە کارێکی باش ئەنجام بدە، ئەگەر ئەو کارەش بچوکو کەمیش بێت. چونکە خاوەن هێزو تواناو کاتیت، ئیتر چاوەڕوانی چی دەکەیت لە دواخستنی کاری باش؟!





# هەوڵدان هەموو پرسیارە ئەستەمەکان شیکار دەکات!

ئا/ بێگەرد هەورامی

لــە یەکێــك لــە زانکۆکانــی کۆلۆمبیــا خوێندکارێك پاش ئەوەی ئامادەی وانەی بیرکاری بوو، زۆرماندووبوو، هەربۆیە لە کۆتایی هۆڵەکەدا دانیشتو بە هێمنییەکەوە خەو بردییەوە!

پاش تــەواو بوونــی وانەکە بــە دەنگی قوتابیــەکان وەخەبــەر هــات، ســەیری بۆردەکەی کرد بینی مامۆســتا دوو پرسیاری لەســەر نووســیوە، بەخێرایــی هــەردوو پرسیارەکەی نووســییەوەو لە هۆڵەکە چووە دەرەوە، گەڕایــەوە بــۆماڵەوە دەســتی کرد بــە بیرکردنەوە لە شــیکاری پرســیارەکان، بەڵام پرســیارەکان زۆر ئەســتەم بوون، هەر لەبەرئەوە چووە کتێبخانەی زانکۆکەو کتێبی پێویستو تایبەت بە وانەکەی وەرگرت...

پاش چوار رۆژ هەوڵو ماندووبوون توانی پرســیاری یەکەمیان شــیکار بــکات، لە دڵی خۆیدا زۆر تووڕە بوو لە مامۆستاکە بە هۆی پێدانی پرسیاری گرانی لەو جۆرەوە!!

بۆ وانەی داهاتووی بیرکاری خوێندکارەکە سەری سوڕما لەوەی کە بۆ مامۆستاکە داوای وەڵامی پرسیارەکان ناکات!!

چوو بۆلای‌و پێی وت: مامۆســتا تەنها بۆ شیکاری پرسیاری یەکەم چوار رۆژی خایاندو لە چوار پەڕەشدا شیکارم کردووە..

مامۆستاکە سەری ســوڕما لە خوێندکارەکەو پێــی وت: بــەڵام مــن هیــچ ئەرکێکم بــە ئێوە نەداوە!!

ئەو دوو پرسیارەش کە نووسیبوم لەسەر بۆردەکــە ئــەوە نموونــەی ئەو پرســیارانە بوون کە تا ئێســتاش زانست دەستەوسانە لە شیکارکردنیان!!

واتە تەنانــەت زاناکانیــش نەیانتوانیوە شیکاری بکەن!!

ئــەوەش قەناعەتێکــی نەرێنییە وای لە زاناکانیش کردووە تەنانەت بیر لە هەوڵ دان بۆ شیکاری ئەو پرسیارانە نەکەنەوە...

ئەگەر ئەو خوێنــدکارە بەخەبەربووایە لــە کاتی باس کردنی ئەو نموونانە گوێی لە وتەی مامۆســتاکە بووایــە، بێگومان ئەویش بیری لە شیکاریان نەدەکردەوە...

هەتا ئێســتەش وەڵامی ئەو پرســیارانە بــە هەر چوار پەڕەکەوە لەو زانکۆیە نمایش دەکرێتو ماوە.

لەم بەسەر هاتەوە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کــە لە ژیانی رۆژانەی هەمــوو یەکێکماندا چەند بیرکردنەوەیەکی نەرێنی کە بە مێشــکماندا دێن دەیانکەینە (مەشخەڵ بۆ شکست)..

زۆرجار وشەی ناتوانم، مەحاڵە، گرانە،... هتد، دەبیســتین، ئەوانەش هیچ نین بێجگە لــە بیرکردنــەوەی نەرێنی چــەوت کە هیچ راستییەك نییە لێیانەوە.

زۆرجــار هــەر بــەو بیرکردنەوانــە بەرنامەڕێــژی لــە هــزرو مێشــکماندا دەچەســپێنینو لە داهاتووشــدا بــە هەمان شــێوەی بیرکردنەوەکانمــان ئەنجامــی بەرنامەڕێژییەکــە دەبینینو دووچاری ئەو رووداوانــە دەبیــن کە کردبوومانــە تەوەری بیرکردنەوەکانمان...

گومانــی تێــدا نییــە کــە هەرکاتێــك سەردەخەینە سەر ســەرین چەندین خەیاڵ و بیرکردنــەوە بــە مێشــکماندا دێت، مەرج نییــە ئەو بیرکردنەوانە بــاشو ئەرێنی بن، هەربۆیە کاتی پێش خەوتن بۆ بیرکردنەوەی نەرێنی بەکارناهێنین...

کەواتە پێویســتە هەســتین بــە دانانی بەرنامــەی باشو داڕشــتنی بیــری باش لە مێشــکماندا بەوەی کە ئێمــەی مرۆڤ خوای گەورە گەورەترین نیعمەتی پێ بەخشــیوین کــە لە ڕێیــەوە دەرك بە شــتەکان دەکەینو دەتوانین بــە دوای هۆکارو چارەســەرەکاندا بڕۆیــنو دەستەوســان نەبین لــە بەرامبەر شــەپۆلەکانی بیرکردنــەوە چەوتەکانمــانو بەرگــری بکەیــنو بــە ویســتو هیممەتــی بــەرزەوە ئەو قەناعەتانە بشــکێنینو بەرەو لوتکە هەنگاو بنێین...

مرۆڤی پشــت بەســتوو بەخــوای گەورەو گرتنەبەری هــۆکارەکان دەتوانێت بە ئاســانی دەســتبەرداری بیرکردنــەوەی هەڵــە ببێــتو بــەردەوام بیرکردنــەوە ئەرێنییەکانمــان بخەینەگەڕ، ئەو کات بە ئاسانی دەتوانین وەڵامی هەموو پرسیارە ئەستەمەکان بدەینەوە!

# گۆڤاری بڕیار لەدیدی خوێنەرانیدا



ئا: محەمەد مێرگەیی

## چاوپێکەوتنێک لەگەڵ بەڕێز: (هەردەوان نەقشبەندی)
## ڕاگەیاندنکارو قوتابی ماستەر لە کۆلێژی کارگێڕیو ئابووری زانکۆی سەڵاحەددین.

**بڕیار: سەرەتا ڕاتان چییە لەبارەی گۆڤاری بڕیار؟ ئایا بایەخی گۆڤاری بڕیار لە چیدا دەبینن؟**

به بڕوای من گۆڤاری بڕیار یەکێکە لە گۆڤارە باشو ناوازەکانو تا ڕادەیەکی زۆرباش توانیویەتی ئەو پەیامەی مەبەستییەتی بە خوێنەری بگەیەنێت بە ئاستی زۆرباش گەیاندوویەتی، من وەکو ڕاگەیاندنکارێك بایەخی گۆڤاری بڕیار لەوەدا دەبینمەوە، کە گۆڤارێکە شێوازی (ڕاگەیاندنی تایبەتمەند)ی وەرگرتووە، ئەمەش گەورەترین گرفتە کە لە نێو ڕۆژنامەو گۆڤارەکانو میدیای کوردی بە گشتی بەدی دەکرێت، واتە تا ئێستا لە نێو میدیای کوردیدا گرنگی بە ڕاگەیاندنی تایبەتمەند نەدراوەو هەر ئەوەش وایکردووە هەموو ڕۆژنامەو گۆڤارەکانمان لەیەکتر بچنو جیاوازی بەدی نەکرێت لە نێوانیاندا، بەڵام گۆڤاری بڕیار لەو گرفتە بەدوورەو لە بڵاوکردنەوەی بابەتەکانیدا هەموو پرەنسیپەکانی ڕاگەیاندنی تایبەتمەند پەیڕەو دەکات.

**بڕیار: سەرەتای ئاشنابوونتان بە گۆڤاری بڕیار لە کام ژمارەوە دەستی پێکردووە؟ چ بابەتێکی گۆڤاری بڕیار زیاتر سەرنجی ڕاکێشاویت؟ تا چەند لە ژیانی پیشەیی سوودتان لێبینیوە؟**

ئاشنابوونی من بە گۆڤاری بڕیار لە ژمارە (6)ەوە بوو، خۆشم بە کەمتەرخەم دەزانم لەو بارەوە و دەبوایە زووتر ئاشنابوومایە بەم گۆڤارە پڕ زانیارییە، هۆی کەمتەرخەمیشم بۆ زۆریو بۆری گۆڤارە کوردییەکان دەگەڕێتەوەو لەو باوەڕەدا نەبووم ڕۆژێك لە ڕۆژان گۆڤارێکی هاوشێوەی بڕیار لە نێو میدیای کوردیدا دروست ببێت، هەموو بابەتێکی ناو ئەم گۆڤارە لای من چێژێکی تایبەتی هەیە، بەڵام بابەتی کارگێڕی بە چیرۆك زۆر سەرنجی ڕاکێشاومو بەردەوام لەگەڵا دەرچوونی ژمارەی نوێ یەکەمین بابەت کە دەیخوێنمەوە (کارگێری بە چیرۆك) ـەو تاڕادەیەکی زۆریش لە ژیانی پیشەیی کەڵکم لێوەرگرتووەو زۆربەی بابەتەکانم بەرجەستە کردووە لە ژیانی پیشەیمدا.

**بڕیار: بەڕێزتان وەکو خوێندکار ماستەر لە کۆلیژی کارگێڕیو ئابووری، پێتانوایە تا چەند بابەتەکانی بواری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی گۆڤاری بڕیار سوودیان هەیە بۆ کەسانی تایبەتمەند بەم بوارە؟**

من پێموایە گۆڤاری بڕیار نەك تەنها وەك گۆڤارێك بەڵکو وەك سەرچاوەیەکی زانستیو ئەکادیمی دەتوانرێت کەڵکی لێوەربگیرێت، هەم بۆ دەوڵەمەندکردنی ئاستی مەعریفیو هەروەها بۆ پەرەپێدانی مرۆییش، چونکە یەك لە فاکتەرە سەرەکییەکانی پەرەپێدانی مرۆیی بەرزکردنەوەی ئاستی وشیارییو مەعریفی تاکەکانە، بەڵام بەداخەوە یەك لە گرفتە هەنووکەییەکانی ئێستای قوتابی، نەخوێندنەوەو پەراوێزخستنی خوێندنەوەیە، کە بەڕاستی ئەمەش بووەتە هۆی دابەزینی ئاستی مەعریفی قوتابیان بە گشتی، بۆیە دەبینین قوتابی لە چەند پەڕەیەکی مەلزەمەیەك کە وابەستەبووە پێوەی، هیچ زانیارییەکی تری لەلا نییەو ئاستی وشیارییو مەعریفی لەو پەڕی لاوازیدایە، بۆیە لەو باوەڕدام ئەگەر بێتو ئاراستەی تێفکرینی قوتابیان بەم شێوەیە بەردەوام بێت بەرامبەر بە خوێندنەوە، ئەوە بەدڵنیاییەوە دەڵێم لە ئایندەدا هەڵگری بڕوانامەی بە (کالۆریۆس) یێك جیاوازی نابێت لەگەڵ نەخوێندەوارێك لە ڕووی مەعریفییەوە.

**بڕیار: ڕەخنەو پێشنیارتان بۆ ئایندەی بڕیار چییە؟**

وەکو ڕەخنە هیچ ڕەخنەیەکم نییە لەسەر ئەم گۆڤارە بەپێزە، بەڵام پێشنیاری من بۆ گۆڤارەکەتان ئەوەیە لە ئێستاو داهاتووشدا لە شێوازی کارکردن لە چوارچێوەی ڕاگەیاندنی تایبەتمەند لا نەدەنو بەردەوام بن لەسەر ئەو شێوازی کارکردنە، چونکە وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا یەك لە گرفتە سەرەکییەکانی میدیای کوردی پەراوێزخستنی کارکردنە لەسەر بنەمای ڕاگەیاندنی تایبەتمەند، هەر ئەوەش وایکردووە ئاستی میدیای کوردی بەردەوام بەرەو دابەزینو دوورکەوتنەوە لە زمانی ڕاگەیاندن بڕوات، لە بری ئەوەی دەبووایە کار بۆ ئەوە بکرێت ئاستی مەعریفی خوێنەر زیاتر بکرێتو لە زمانی ڕاگەیاندن نزیك بکرێتەوە.

**بڕیار: لە کۆتاییدا زۆر سوپاس بۆ بەڕێزتانو هیوای سەرکەوتنیش بۆ ئێوە.**

# ئاسۆی وێنەیەك

سەرنجی ئەم وێنەیە بدەو بە دیدو خەیاڵی تیژو هەستی ناسکت بۆی بنوارەو پاشان خامەکەت هەڵبگرەو گوزارش لەو هەستە ناسكو خەیاڵە وردو سۆزە بێ سنوورەت بکە، تا ببیتە خاوەنی یەكێك لەم دوو خەڵاتەی خوارەوە:

- بەشداری بێ بەرامبەری ساڵێکی گۆڤاری بڕیار.
- بەشداری بێ بەرامبەری شەش مانگی گۆڤاری بڕیار.

دوا مۆڵەتیش بۆ وەرگرتنی وەڵامەکان (١٠) رۆژ دوای دەرچوونی گۆڤارەکەیە.





سوپاس بۆ ئەو بەڕێزانەی کە لە خوارەوە ناویان هاتووە، بە شیعر یاخود پەخشان بابەتیان ناردووە بۆ ئاسۆی ژمارە (٢١)

١-زەردەشت واژەیی

٢-راستی فەهمی

٣-بەهرە عەبدوڵا

# راهێنانی مێشك

**بە وردی لەم وێنەیە**
**ورد بەرەوەو**
**هێزی مێشكو بیركردنەوەت**
**بخەرەكار،**
**بزانە چی دەبینیت؟**
**تا چ رادەیەك دیدی تێروانینت وردە؟**



## خەڵاتی یەكەم

ئەردەوان روستایی

دڵم چەشنی ئەو گوڵدانە رەنگی زەردە
خوڵی ناخم بێ ئومێدیوخەمو دەردە
خۆزگەی دڵم وەك ئەم گوڵە هەر چرۆیە
وەرزی تەمەن تەنها بۆ من رەنجەرۆیە
لەم ژیانە هیوا كوژی بەشی منە
بێ خۆر ئەژیم بۆیە گریان پیشەی منە
خۆزگەكانم وشك بوونیان پێوە دیارە
نوقمی بەفرم كەچی هەر تینوم لەم شارە
شارەو شارم زۆركردووە هەربێ ماڵم
خۆزگەكانم هێندە تینوون بۆ قەترە ئاوێ عەودالْم
چاو هەڵدێنم دڵۆپێك ئاوم لێ دیارە
ئەوەی تێرم كا لەو ئاوە تەنها گۆفاری بڕیارە
تەنها شیرە پڕ ئاوەكەی ئەم بڕیارە
تینویەتی دڵ دەشكێنیو دەردیش چارە

## خەڵاتی دووەم

زاهیری شێخ رەزا

لەم وێنەدا، دەبێ چ ستەم كاری
ئاو نەبەخشێ بەم گوڵە جوانەی بەهاری
حەزكا سیس بێ لە باتی ئەوەی گەش بێ
خوایە ئەو كەسە دایم ڕوو ڕەش بێ
با ئینجانەكەت زەردو ئاڵتون بێ
كاتێ بێئاو بووی دەبێ تینوت بێ
ئاوە نهێنی جوانی ئەو گوڵە
ئاوە دەبە خشێ گوڵ بەئەو چڵە
دڵۆپێك ئاو كە تۆزێكەو بچوكە
بۆ تەیرێكی كچكە بەشی دەنوكە
ئەگەر ئەو قەترە نەبوایە لە سەر خاك
گەرما گشت زەوی دەكردە سوتماك
سەیر كەن لە دەنكە بارانی بچوك
لە ئەو پێكهاتووە لافاوی چاپووك

# ئازاردانی ئافرەتان به هۆی زەنگی مۆبایلەوە!



پەری شێخ کەریم

**ئـەم ئامێرە پێشـکەوتووە بووەتە زیادبوونی کێشە خێزانییەکان.**
**لـە دوای کڕینـی ئـەم ئامێـرەوە کێشەکانمان دەستی پێکرد!**
**ئافرەت خودی خۆی بەر پرسـیارە لە درکاندنی نهێنییەکانی نێو ماڵەکەی لە ڕێگەی مۆبایلەوە!**
**جاسوسـیکردنی زەنـگ و نامـەی مۆبایلی ئافرەتان لە لایەن پیاوانەوەو بە پێچەوانەوە بووەتە زیادبوونی کێشـە خێزانییەکان!**
**متمانەبوون بـە یەکتری کۆڵەکەی ژیانی هاوسەرێتییە!**

مۆبایـل تەکنەلۆژیایەکی نوێیە، جگە لەوەی کـە سـودێکی زۆری هەیـە بۆ ژیانـی ڕۆژانەمان لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جار زیانەکانی لە هەندێ خێزانـدا زیاتـرە وەك لـە سـوودەکانی، ئەویش بەهۆی بەکارهێنانیان لە لایەن چەند کەسـانێکی ئاسـت نزمو بێڕێزو نەزان کـە گاڵتە بە ئابڕووی خەڵکی دەکەن،

لـەم ژمارەیـەدا زۆر بـە پێویسـتم زانی کە چەند وتەیەك ئاڕاستەی هاوسەرانی بەڕێز بکەم، لە کاتی دروسـتبوونی هەر کێشـەیەکدا یەکسەر حوکمـی خراپ بەسـەر خێزانەکانیانـدا نەدەن، بە شـێوەیەکی زیرەکانە بیر لە چارەسـەرکردنی بکاتەوە نەك سـزادان یـا لێـك جیابوونەوە، بە تایبەتی هەندێ لە ئافرەتان جەخت لەسـەر ئەوە دەکەن کە هاوسەرەکانیان زۆر دڵڕەقانە مامەڵەیان لەگەڵـدا دەکەن، کاتێـك زەنگێکیان بـۆ دێت لە ژمارەیەکی نەناسـراوەوە بەتایبەتـی لە درەنگی شـەودا بە بێئـەوەی بپرسـن یا لێـی بکۆڵنەوە حوکمـی خـراپ دەدەن بەسـەر خێزانەکەیاندا، هەروەك زۆر جار دەبیستین زۆرێك لە خێزانەکان لێك جیابوونەتەوە یا بۆتە هۆی کوشتنی ئافرەت لـە لایـەن پیاوانەوە بە ڕاسـتی ئەمـە کارێکی زۆرهەڵەیەو جێگایی داخو نیگەرانییە!

ئایا متمانەبوونت بەرامبەر خێزانەکەت ئەوەندە کەمە کە ژیانی خۆت تێك بدەیت!

لـە کاتێکـدا متمانەبـوون کارێکی زۆر پێویستە لە نێوان یەکتریداو کۆڵەکەی ژیانی هاوسەرێتییە، ڕەنگە مرۆڤ زۆرجار متمانەی بە هەندێ پەیوەندی نەبێ لەگەڵ تاکەکانی کۆمەڵگاداو تووشی گومانو دوودڵییەك ببێت ڕەنگە بتوانێت بە ئاسـانی چارەسەری بکات، بـەڵام لە پەیوەندی خێزانیدا لە دەسـتدانی متمانـە ژیانێکی بـێ مانـاو زیانبەخش بۆ هەردوولا دروست دەبێت.

متمانەبوون بە یەکتری شـتێکی سـادە نییە کە هاوسەران تەنها جارێك لە ژیانیاندا بەکاریبهێنن.

ئافرەتێك باسـی متمانەی هاوسـەرەکەی دەکاتو دەڵێـت: ڕۆژێـك دوای گەڕانـەوەی هاوسـەرەکەم بۆ ماڵـەوە، جلوبەرگی کاری گـۆڕی، گیرفانـی چاکەتەکەیـم پشـکنی تا شـتەکانی ناوی دەربهێنمو بیشۆم، بینیم کە فۆڕمی کڕینـی سـیمکارتێکی تێدایە هەمان ژمـارە بوو کە بەردەوام بـە ڕۆژدا تەلەفۆنم بـۆ دەکات، زۆر دڵتەنـگ بـووم بەوەی هیچ متمانەیەکـی پێم نییە دەیەوێت بزانێت ئایا مـن ناپاکی لـێ دەکەم یان نـا؟ یاخود بۆی دەربکەوێت هەڵسـوکەوتی مـن چۆنە ئەگەر پیاوێك تەلەفۆنم بۆ بکات!

مۆبایل وەك شمشـێرێکی دووسـەر وایە پێکـەوە واتە هـەردوو لایەنی چاكو خراپی هەیـە، بەڵام ئادەمیزاد لە دەسـتی خۆیدایە ئایا بۆچی بـەکاری دەهێنێت. لێرەدا چەند پیشنیارێك دەخەینە ڕوو:

١- باوەڕناکـەم مۆبایـل هۆکارێك بێت بۆ دروسـتبوونی کێشە خێزانییەکان، بە تایبەتی ئەگـەر هـەر دوولا تێگەیشـتووبن، بەڵکـو بەپێچەوانـەوە لە کاتـی ئامادەنەبوونی هەر لایەکـدا دەتوانن لـە ڕێی مۆبایلـەوە هەواڵی یەکتری بپرسـن، ئەمەش هۆکارێکە بۆ زیاتر خۆشەویسـتی نێوان خێزان، بۆیە لەم ڕووەوە پێداویستییەکە لە پێداوستییەکانی خێزان.

٢- کاتێك هاوسەر ئامۆژگاریی خێزانەکەی دەکات یـا باوك بۆ کچی یا خوشـکی بەوەی کـە ژمـارە ی مۆبایـل بە هەموو کەسـێك مەدە، پێویستە لەسەر هەموو خوشکێك زۆر ئـاگاردار بێت لەو کارە تا تووشـی ناکۆکیو گومان نەبێت لە لایەن هیچ کەسێکەوە.

٣- خوشکی بەڕێز مۆبایل بەکاردەهێنرێت بـۆ جێبەجێکردنی پێداوسـتییەکان، ژیانت نـەك بـۆ دەرخسـتنی نهێنییەکانـی نێـو ماڵەکـەت لە لای کەسو هاوڕێکانت! هەروەك هاوسـەرێك دەڵێـت: کاتێك کێشـەو ناکۆکی کەوتـە نێوانمانـەوە کـە ئەم ئامێـرە هاتە ماڵمانەوە! چونکە هەمیشە خێزانەکەم هەموو دەنـگو بـاسو نهێنییەکانی نێـو ماڵەکەی لەڕێی مۆبایلەوە باس دەکات، بەڕاسـتی زۆر بێزار بووم بەم کارە ناشـیرینە، چونکە زۆر

کێشــە زۆر ئاســانە خۆمان پێکەوە دەتوانین چارەسەری بکەین، بەڵام کاتێك خوشكو دایك یان هەرکەســێکمان بێت و قسەی تیادا بکات کێشەکە ئاڵۆزتر دەبێت، بۆیە دەڵێم ئافرەتان خۆیان بەرپرسیارن لە بەکارهێنانی مۆبایل!

٤- کارێکی زۆر ناشــرینە جاسوســیکردنی پیاوان لــە لایەن ئافرەتانەوەو بە پێچەوانەوە، چونکە گەورەتــرو ئاڵۆزتر دەبێــت، بەڵکو لە کاتــی بینینی هەر نامەیەك یاخود ژمارەیەکی نەناسراو پێوستە بەشێوەیەکی ژیرانە پرسیار بکەینو ڕێنمایی بکەین بــۆ چاکە· (ئافرەتێك باســی هەڵەی خــۆی دەکاتو دەڵێت: ڕۆژێك مۆبایلــی هاوســەرەکەم پشــکنی بینیم وێنەی ئافرەتێکــی ڕووتــی تێدایــە، خۆزگــە ئــەو بێئەقڵیــەم نەکردایە، چونکە پێش ئەوەی ئەم کارە بکەم ڕێزم لە لای هاوسەرەکەم زۆر بوو، ئەوەی منی زیاتر دڵتەنگ کرد ئەوەبوو کە ئەم وێنە لەڕێی بلوتۆسەوە نەنێردرابوو، بەڵکو بە مۆبایلی خۆی بە دەنگو ڕەنگەوە گیرا بوو·

پاش ماوەیــەك نەمتوانی ئــەم نهێنییە لــە نێو دڵمدا بپارێزم، قســەم لە گەڵدا کرد چــۆن وێنــەی ئــەم ئافرەتەت گرتــووە؟ بە شێوازێکی ناشــرین پرسیارەکانم لێ دووبارە دەکردەوە بەبــێ ئەوەی وەڵام بداتەوە، بەڵام بینیــم بۆ چارەســەرکردنی هەڵەکەی چەند وتەیەکــی درۆی دروســت دەکــرد، کە بەڵگە نەبــوو بــۆ کردەوەکانــی، بەڵام پــاش ئەوە هەمــوو مامەڵەیەکی گــۆڕاوە لەگەڵمدا، هیچ ڕێزو خۆشەویســتییەك نەما لــە نێوانماندا جگە لە بەکارهێنانی وتەی ناشرین بەرامبەر یەکتری، بەردەوام شەڕو ناکۆکیو لۆمەکردنی یەکتــری بۆتــە پیشــەمان، هیــچ ئــاگام لە ڕۆیشــتنو هاتنــەوەی بۆ ماڵــەوە نییەو بە کورتی دووکەسی لێك دوورین)·

ئامۆژگاریم بۆ هەموو خێزانو هاوسەرە بەڕێــزەکان ئەوەیــە لە کاتــی بینینی نامە یاخود زەنگ لە لایەن کەســی نەناسراوە بە شێوەیەکی زیرەکانە پرسیار بکەو لە کارەکە بکۆڵــەوە، کە بتوانیت کێشــەکە چارەســەر بکەیــت نەك زیاتر تــووڕە ببیتو بوختانی تری بۆ دروست بکەیت·

داواکارم لــە هەمووخێزانێك دووربن لە هەموو کێشەیەك ،ئەو چیرۆکانەی کە لێرەدا باســکراوە هەمووی ڕاستەقینە بەڵام ناوەکان نەنووســراوە هیــوادارم هیچ لایەك تووشــی ناکۆکی نەبێت·

خوێنەرانــی بەڕێــز: حەزدەکــەم ڕاوو بۆچوونتــان وهــەر تێبنیەکتــان هەیــە لە بارەی گۆشەی خێزانی بەختەوەرەوە دەتوانن بینێرن لەڕێگای ئیمێلی بڕیارەوە ·



# 10 چرپە لە هونەری گفتوگۆدا

و: ئەمیر ئەحمەد عەبدولقادر

خۆشەویســتان···· تاکو ســەرکەوتووبین لــە گفتوگۆکانماندا··· بۆئــەوەی پابەندبین بە پاراســتنی کەشوهەوای کۆبونەوەکانمانو پێکگەیشــتنەکانمان··· بۆئــەوەی لێیــان دەربچیــن بە ســوودو بەرهەمی بــاش، ئەم چەند چرپەیەم بە کورتی بۆ نووســیون، لە دڵێکی پڕخۆشەویستی دەرچووە، هیوا خوازم لە دڵێکی پڕ خۆشەویست ئارام بگرێت، بۆیە داواکارم لە گەڵیاندا نەرم ببن·

**چرپەی یەکەم:** قســە بە بەرامبەرەکەت مەبــڕە، وازی لــێ بهێنــە تاکــو ڕای خــۆی دەردەبڕێــتو بــە تەواوی ئــەوەی دەیەوێت دەیخاتە ڕوو·

**چرپــەی دووەم:** هــەوڵ بــدە هەمــوو ئەو ســەرنجانەی کە بەرامبــەرت دەیانخاتە ڕوو وەریــان بگریت، پێش ئــەوەی وەڵامیان بدەیتەوە، لە سەرخۆبە پێش ئەوەی گفتوگۆی لە گەڵدا بکەی·

**چرپەی ســێیەم:** ئامــان بیروڕای خەڵك بە کــەم مەزانە، گرنگی خــۆت دەربخە بەو قسانەی دەیکات، ئەگەر باوەڕیشت بەو قسانە نەبوو کە دەیانکات·

**چرپەی چوارەم:** سادەبە لە گفتوگۆکانتدا، بــەو شــێوەیەی خەڵك لێت تــێ دەگات ئاوا لــە گەڵیانــدا بدوێ، خــۆدوور بگــرە لە لچ هەڵقرچاندنو قوڵ بوونەوە لە قسەکانتدا·

**چرپەی پێنجەم:** باشــترین جۆری قســە ئەوەیــە کــورت بێــت، درێــژە نەکێشــێتو بەرامبەرەکــەت تووشــی بێــزاری بکەیــت، قسەکانت کورت بکەرەوە، تەنها قسەی سوود مەند نەبێت مەیکە·

**چرپەی شەشەم:** بە ڕەوشتی بەرزو جوان لەگــەڵ خاوەن ڕاو زانادا بدوێ، کاتی گونجاو بۆ ئەمە هەڵبژێرە، زۆریان لێ مەکە، چونکە ئەوان بەشتی گرنگترەوە سەر قاڵن·

**چرپــەی حەوتــەم:** خۆ بــە دوور بگرە لە بــاس کردنی خەڵك لــە گفتوگۆکردنتدا، گفتوگــۆی ڕای خــۆت بکــە بێئــەوەی تێك بگیرێی لەگەڵیاندا·

**چرپــەی هەشــتەم:** بــە ســۆزو خۆشەویســتییەوە لەگــەڵ ئــەو کەســەی گفتوگۆی لەگەڵدا دەکەیت هەڵسوکەوت بکە، جیاوازی بیــروڕا وات لێ نــەکات بێبەزەیی بیت لە گەڵیدا، چونکە ئەمە دەبێتە هۆکاری وەرنەگرتنی بیروڕایەکانت·

**چرپــەی نۆیــەم:** جوانترینو باشــترین وشەو ڕستە هەڵبژێرە، خۆ بە دوور بگرە لە شتی بریندار کار، ئاگادارت دەکەم لە تاوانبار کردنی ئەو هەستەی لە ناخی مرۆڤدایە·

**چرپــەی دەیــەم:**· ئەگــەر هەســتت بە بــێ ســوودی گفتوگۆیەکەت کــرد، کە هیچ سوودێکی نییە، یاخود بەرامبەرەکەت هەستا بە مشتو مڕکردنو ڕکابەری کردن خۆتی لێ بە دوور بگرە·

# مرۆڤ بۆچی خۆی دەکوژێت؟

بەرزان ئەبوبەکر

دیاردەی خۆکوشتن دیاردەیەکی باوو قێزەونی نێو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییە، ئەگەر جاران تەنها لە نێو دەوڵەتە هەژارەکانی جیهانی سێهەمدا باو بووبێت، ئەوا ئەمڕۆ دیاردەیەکی باوی نێو کۆمەڵگەو دەوڵەتە پێشکەوتووەکانی جیهانە، بۆ نموونە: یابان کە تەواوی مرۆڤایەتی ئیرەیی بە پێشکەوتنو تەکنەلۆژیاو ناوبانگو بیری بەهێزو کارامەییان دەبات، تەنها لە ساڵی ٢٠٠٩دا (٣٠١٨١) کەس خۆیان کوشتووە کە زۆربەیان لە ڕەگەزی نێرینە بوون!

ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە سەرکردایەتی تەواوی جیهان دەکات، لەم دیاردەیە نەك خاڵی نییە بەڵکو ڕێژەی خۆکوشتن لەو وڵاتەش ڕێژەیەکی نائاساییە تەنها لە ساڵی ٢٠٠٩دا (٢٩٠٠٠) حاڵەتی خۆکوشتن تۆمار کراوە، بەپێی ئامارێك کە لە ڕۆژنامەی (یو· ئێس· تودەی) ئەمریکی ڕۆژانە (٨٠) حاڵەتی خۆکوشتن ڕوودەدات!

گۆڤاری (ذی لانست)ی بەریتانی کە لە ١٨ی نیسانی ٢٠٠٩ دەرچووە ئاماژە بەوە دەکات کە ساڵانە لە جیهاندا یەك ملیۆن کەس خۆیان دەکوژن، بەم پێیەش هەموو (٤٠) چرکەیەك لە جیهاندا کەسێك خۆی دەکوژێت!

ئەم دیاردەیە بۆتە نەریتێکی نێگەتیڤی نێو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، بۆیە پێویستە چارەسەرێك بۆ ئەو دیاردەیە بدۆزرێتەوە·

ڕەنگە هۆکاری خۆکوشتن بە شێوەیەکی گشتی بریتی بێت لە نەبوونیو نەداریو گرفتە داراییەکانو خەمۆکیو کێشە کۆمەڵایەتیو خێزانییەکانو نەگەیشتن بە ئاواتو هیواکانو ڕەشبینیو بێ هیوایی··· هتد، لەگەڵ ئەوەشدا ئێستا لە نێو خۆکوژاندا کەسانێك هەن زۆربەیان خاوەن بڕوانامەو سەروەتێکی بێ شومارنو هیچ کام لەو گرفتانەیان نییە!

بە هەرحاڵ ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە باسی لێوە بکەین ئەوە نییە کە بزانین ڕۆژانەو ساڵانە چەند کەس خۆیان دەکوژن، بەڵکو دەمانەوێت لەوە بدوێین کە بۆچی مرۆڤ پەنا بۆ خۆکوشتن دەبات؟

١- دروست بوونی فەراغی ڕۆحی: چۆن مرۆڤ بەردەوام پێویستی بە خۆراكو هەناسەدان هەیە، هەرواش لایەنی ڕۆحی مرۆڤ پێویستی بە خۆراك هەیە، پێشەوا ئیبن قەییم لەو بارەیەوە دەڵێت: (جەستە چەند پێویستی بە هەناسەدانە، ڕۆح زیاتر پێویستی بە خۆراکە)! بەڵام خۆراکی ڕۆح جیاوازە لە خۆراکی جەستە، خۆراکی ڕۆح لەسەر سفرەو خوانەکان دەست ناکەوێت، لە نێو بازاڕەکان نافرۆشرێت، بە پارەو سەروەتو سامان بە دەست نایەت، بۆیە مرۆڤ کاتێك خواردن بە ڕۆحی نادات فەراغێکی بۆ دروست دەبێت کە نازانێت چۆن پڕی بکاتەوە، ئەمەش یەکێکە لە هۆکارە سەرەکییەکان کە مرۆڤ لە ئەنجامی ئەو فەراغە ڕۆحییەدا کە نازانێت چۆن پڕی کاتەوە بۆیە وا دەزانێت خۆکوشتن چارەسەرەو لە ئاکامدا پەنا بۆ خۆکوشتن دەبات!

کەواتە بۆئەوەی ئەو فەراغە پڕ بکەیتەوە، بۆئەوەی دڵت هەمیشە ئاسودەو ئارام بێت، ڕۆژانە خواردن بە ڕۆحت بدە، باشترین خۆراك بۆ ڕۆح بریتییە لە پەرستنی پەروەردگاری باڵادەست·

٢- دەستەوسان لەبەردەم چارەسەرکردنی کێشەکانی ڕۆژگار: ئەوانەی کە پەنا بۆ خۆکوشتن دەبەن، کەسانێکن کە شکستخواردوون لە بەردەم کۆسپو نارەحەتییەکانی ژیان، لە ئەنجامی کەم توانایيو بڕوا بەخۆ نەبوونو نە دۆزینەوەی ڕێگە چارەیەك بۆ کێشەکانی ژیانیان پەنا بۆ خۆکوشتن دەبەن، مرۆڤی ئازاو ژیر لە بەرامبەر نارەحەتییەکانی ڕۆژگار نەك هەر چۆك دانادات، بەڵکو بەردەوام لە هەوڵی

چارەسەرکردنیاندایە، مرۆڤی ژیر دڵنیایە ڕۆژگارە ناخۆشییەکانی ژیان بەردەوام نین، کورد وتەنی تەنگانە بەری کورتە!

٣- خۆکوژان وا دەزانن مردن خاڵی کۆتاییە: ئەو کەسانەی خۆیان دەکوژن پێیان وایە ژیانی دنیا کۆتا ژیانەو بە دەرچوونیان لە دنیا هەموو شتێك کۆتایی دێت، ئەمەش بۆچونێکی زۆر هەڵەیەو لە ڕاستییەوە دوورە، ژیانی دنیا بریتییە لە چەند ڕۆژێکی کەم ئەمڕۆ یا سبەی کۆتایی پێ دێت، کەواتە نایەوێت بەر لە هاتنی کۆتایی ئەو چەند ڕۆژە کەمە بە دەستی خۆت کۆتایی پێ بێنیت، مرۆڤ لەم ژینەدا لە بەردەم تاقیکردنەوەیەکی گەورەدایە، دەتوانیت بە ڕۆژگارە کەمەکانی ژینت، ژیانێکی هەمیشەیی پڕ لە خۆشیو شادی بە دەست بهێنیت، ئێستا با پێکەوە بیرێك لە گەردون بکەینەوە تا بەهۆیەوە زیاتر بۆمان ڕوون ببێتەوە کە ژینو مردنمان بێ هۆ نییەو مردنیش کۆتایی ڕێگە نییە:

* ئایا هیچ کات بیرت لە هەڵهاتنی ڕۆژو تاریکایی شەو نەکردۆتەوە؟ پرسیارت لە خۆت نەکردووە بۆچی لەسەر زەوی شەو ڕۆژ دروست بووە؟ ڕەنگە وەڵامەکەی زۆر سانا بێت!

* ئایا هیچ کات لە هەڵوەرینی گەڵای درەختەکانو دووبارە نوێبوونەوەیان ورد بوویتەوە؟!

* ئایا بیرت لە درەختە هەمیشە سەوزەکان کردۆتەوە؟

* ئایا لە ڕۆژگارەکانی بەهاردا سەرنجی زەویت داوە چۆن دوای مردنو وشکبوونی سەر لە نوێ زیندوو دەبێتەوە؟

* ساتێك تەنها دانیشتووی لە شەوگارێکی سامالْدا تا بیر لە ئەستێرەکانو وردەکارییەکانیان بکەیتەوە؟

* هیچ کات گەشتت کردووە بۆ ڕۆخی دەریاو بیرت لە دەریاو ژیانی زیندەوەرانی نێو ئاو کردبێتەوە؟

* قەد بووە کاتێك بە لای چیایەکدا تێ پەڕیتو پرسیار لە خۆت بکەیت سەبارەت بە جوانیو بەهێزی سروشتەکەی؟

ئەمانەو چەندین پرسیاری دیکە، ئەوەت بۆ ڕوون ناکاتەوە کە مردن کۆتایی ڕێگە نییە!

کەواتە با پێکەوە بڕیار بدەین کە وەکو مرۆڤێکی بەهێزو لێهاتوو ژیر، شکست نەخۆین لە بەرامبەر ناڕەحەتیو کێشەکانی ژیان، لە بری شکست با هەوڵی چارەسەرو پەند وەرگرتن بدەین! با ئێمەش وەکو مرۆڤە سەرکەوتووەکان خشتێك لە دیواری ئەم ژینەدا دابنێینو سوودێك بە کۆمەڵگەو مرۆڤایەتی بگەنین، بە هیوای ژیانێکی خۆشو بۆ ئاسوودە بۆ هەمووان!

# سوپاسی خوا ئەکەم

و/ لە فارسیەوە : سەردار صالح محمد

سوپاسی خوا ئەکەم، کە شەو تا بەیانی (پرخە پرخی) هاوسەرەکەم دەبیستم، ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئەو زیندووەو لە تەنیشتمەوە نوستووە...

سوپاسی خوا ئەکەم، کە کچەکەم هەردەم لە شۆردنی دەفرەکان (بۆڵە بۆڵ) دەکات، ئەمەش مانای ئەوەیە کچەکەم لەماڵەوەیەو وێڵی سەر شەقامەکان نییە...

سوپاسی خوا ئەکەم، کە لە (لەوەڕاندنی مەڕەکان) ماندوو بووم، ئەمە واتە من خاوەن ماڵو سامانمو مەڕی زۆرم هەیەو خوای گەورە نیعمەتی بە سەرمدا ڕژاندووە...

سوپاسی خوا ئەکەم، کە دەبێت هەموو شەوێك پاشماوەی بەردەستی میوانەکانم پاك بکەمەوە، ئەمەش مانای ئەوەیە کە من لەناو دۆستو خزمانی خۆمدامو دوورم لە غەریبی..

سوپاسی خوا ئەکەم، کە (جلەکانم) کەمێ بۆم تەنگ بۆتەوە، ئەمەش مانای ئەوەیە کە خواردنی باشم هەیەو هەندێك کێشم زیادی کردووە...

سوپاسی خوا ئەکەم، کە جەستەم کەشەگ بووە لە دەست کارکردن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە توانای کاری سەختم هەیە.

سوپاسی خوا ئەکەم، دەبێت هەمیشە ناوماڵو پەنجەرەکان بشۆم.. ئەمەش مانای وایە کە خانووی گەورەم هەیەو لەو دەشتو دەرە ناژیم...

سوپاس بۆ خوا، کە لە جێگایەکی دوور سەیرانگایەکم پەیدا کرد بۆ گەشت کردن، ئەمەش یانی هەم توانای بە پێ ڕێکردنم هەیەو هەم ئۆتۆمبیلم هەیە بۆ سواربوون...

سوپاسی خوا ئەکەم، کە هەردەم گوێم لە دەنگە دەنگی هاوسێکانمە،

ئەمە مانای وایە کە هێشتا توانای بیستنم ماوە...

سوباس بۆ خوا، کە ئەم هەموو (ئوتو) کردنەم هەیە،

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە جلی زۆرم هەیە بۆ لەبەر کردن

سوپاسی خوا ئەکەم، کە بەیانیان بە زەنگی کاتژمێرەکەم خەبەرم دەبێتەوە،

ئەمەش مانای وایە کە هێشتا زیندووم.

سوپاسی خوا ئەکەم، کە هەندێ جار نەخۆش ئەکەوم،

ئەمە یانی زۆربەی کاتەکانم لەشساغم.

سوپاسی خوا ئەکەم،کە کڕینی (دیاری) گیرفانی بە تاڵ کردووم،

ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئازیزانی زۆرم هەیە کە شایانی خەڵات کردنن...

سەرچاوە: نامیلکەی (خدا را شکر میکنم).

# ئێوارەیەك لە ئامۆژگاری

و/ بەهمەن لەتیف فەتحوڵ

ئێوارەیەکیان، کاتێك رۆژ ماڵئاوایی کردو شەوێکی نوێ لەدایك بوو، کچێك پاش تەواوبوونی لە دەوامی ئەو رۆژەی بە ماندووبونێکی زۆرەوە گەڕایەوە ماڵ، دوای سەلامو بەخێرهێنان لای باوکە دڵ نەرمە میهرەبانەکەی دانیشتو دەردە دڵی بۆ کرد.

کچەکە باسی نیگەرانی خۆی دەربارەی ژیانی پڕچەرمەسەری دونیا بۆ باوکی دەکردو دەیگوت: بابەگیان ماندوو بووم بە دەست قورسیو گرانی ئەم ژیانەوە، نازانم چی بکەم تا بتوانم رووبەڕووی ئەم هەموو کێشەیە ببمەوە، چیتر ناتوانم بەرامبەر ئەم گرفتانە بووەستم، بێزاربووم لە هەوڵدانو جەنگ لەپێناو ئەم ژیانەدا، کێشەیەك چارەسەر نابێت، کێشەیەکی تر لە دایك دەبێت! توانام نەما، سەختی ژیان چۆکی پێدادام.

کچەکە کاتێك ئەم قسانەی دەکرد، خۆیشی نەیدەزانی ئەم دەنگە لە قوڕگییەوە دێتە دەر یان ڕاستەوخۆ دەنگی ترپەکانی دڵییەتی، سەرجەم وتەکانی ئەم کچە تێکەڵ بە ئاوازێکی پڕ لە گریانو فرمێسکی لە دوایی نەهاتووی ناو چاوەکانی، بەر گوێی باوکە دڵ نەرمو ژیرەکەی کەوت، کە بەجۆشو پەرۆشەوە گوێی بۆ ئازارەکانی کچە نازدارەکەی راگرتبوو.

کاتێك باوك گوێی لەکچەکەی دەگرت، نائومێدیو خۆبەدەستەوەدانی لە وشەکانیدا بەدی دەکرد، بۆیە بڕیاری دا وانەیەك فێری کچەکەی بکات تا سەرلەنوێ متمانەو باوەڕبەخۆ بوون بۆ کچەکەی بگێڕێتەوەو ئومێدی ژیانی پێببەخشێتەوە.

باوکە کچەکەی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ چێشتخانەو سێ دەفری هێناو پڕی کردن لە ئاوو لەسەر ئاگر داینان، هێندەی نەبرد ئاوەکان گەرم بوون.

باوکەکە هاتوو گێزەرێکی خستە ناو دەفری یەکەمو هێلکەیەکی خستە دەفری دووەمو هەندێك دەنکە قاوەش بۆ دەفری سێیەم، پاشان سەر لە نوێ ئاگرەکەی هەڵکردەوەو چاوەڕێ بوو.

کچەکە ئارامی نەما! هەرچەند بیری دەکردەوەو هەوڵی دەدا نەیدەتوانی لە مەبەستی باوکی تێ بگات.

باوکەکە چەند خولەکێك وەستاو، پاشان ئاگرەکەی کوژاندەوە، هەریەکە لە گوێزەرو هێلکەو قاوە کوڵاوەکەشی خستە ناو سێ قاپی جیاوازەوەو لە بەردەم کچەکەی دایناو وتی: ئازیزەکەم چی دەبینیت؟

کچەکە هەرچەند زۆر سەرسام بوو لە پرسیارەکەی باوکی، بەڵام وەڵامی دایەوە: گێزەرو هێلکەو قاوەی کوڵاو.

پاشان باوکەکە وتی: دەست بدە لە گێزەرەکە!! هەستی کرد گێزەرەکە ناسکو نەرم بووە.

پاشان وتی: توێکڵی هێلکەکە لێبکەرەوە!! وتی هێلکەکە رەق بووە.

پاشان فەرمانی پێدا هەندێك لەقاوەکە بخواتەوە!! کچەکە زەردەخەنەیەکی کردو وتی: بە تامە.

پاشان کچەکە پرسیاری کرد: بەڵام ئەمانە چی دەگەیەنن باوکە؟

باوکەکە سەیرێکی کچەکەی کرد، وەك ئەوەی پێی بڵێت: کە دەیەوێت وانەیەکی بە سوودی فێربکات بۆ ژیان، وتی: کچە ئازیزەکەم بزانە هەریەکە لە گێزەرو هێلکەو قاوەکە رووبەڕووی یەك دوژمن بوونەوە، ئەویش ئاوە گەرمەکە بوو، بەڵام هەریەکە لەوانە بە رێگایەکی جیاواز مامەڵەی لەگەڵ ئەو دوژمنەدا کرد.

وەکو بینیت گێزەرەکە لە سەرەتادا رەقو بەهێز بوو، بەڵام پاش گەرم کردن نەرمو بێ هێز بوو.

بەڵام هێلکەکە توێکڵە رەقەکەی دەرەوەی ناوەڕۆکە شلەکەی دەپاراست، بەڵام کاتێك گەرم کرا ناوەڕۆکەکەی رەق بوو.

بەڵام دەنکە قاوەکان بە شێوەیەکی زۆر جوانو بە سوود مامەڵەیان لەگەڵ دوژمنە سەختەکەیاندا کردو توانیان کار بکەنە سەر ئاوە گەرمەکەو بیگۆڕن.

ئەی تۆ چی کچم؟

ئایا تۆ ئەو گێزەرەی لە سەرەتادا توندو بەهێزیت، بەڵام کاتێك رووبەڕووی ئازارێك دەبیتەوە، لاواز دەبیتو هێزەکەت لەدەست دەدەیت؟

یان تۆ هێلکەکەیت.. دڵێکی نەرمو ئارامت هەیە... بەڵام کاتێك تووشی کێشەیەك دەبیت دڵ رەقو بەهێز دەبیت؟ گەرچی رووخساری دەرەوەت وەکو توێکڵی هێلکەکە نەگۆڕاوە... بەڵام ناخت گۆڕاوە.. دڵت پڕ بووە لە تاڵییەکانی ژیان.

یان تۆ وەکو دەنکە قاوەکەیت.. کاتێك ئاوە گەرمەکەی گۆڕی.. (ئەو ئاوەی سەرچاوەی ئازارو کێشەکان بوو).. ئێستا ئەم گۆڕی بۆ ئاوێکی بەتامو بەسوود.

ئەگەر تۆ وەکو دەنکە قاوە بیت.. ئەو کاتە دەتوانیت سەرجەم شتەکانی دەوروبەرت بەرەو باشتر بگۆڕیت..

بیر بکەرەوە کچە ئازیزەکەم چۆن لەگەڵ سەختی ژیاندا مامەڵە دەکەیت، کەواتە ئێستا پێم بڵێ تۆ گێزەریت یان هێلکە یان قاوە؟!!

سەرچاوە: www.maharty.com

هێمن ئەحمەد ڕەسوڵ

# با چاوەکانمان وا فێربکەین!

١- باچاوەکانمان لە ژێرگوڵەکان دڕك ببینن‌و لەگەڵ دڕکەکانیش ئاشنای گوڵ بن·

٢- تابچوکترین عەیب‌وعار لە خۆتدا هەبێت، سەیری عەیب‌وعاری خەڵکی نەکەن·

٣- هەموو مرۆڤێك دوو ڕووی هەیە: (باش‌و خراپ- ڕووخسارو ناخ) با چاوەکانمان بە هەردوو ڕوو لێی بڕوانن·

٤- پێش ئەوەی چیاکان ببینن، با لە بەردە بچکوکەکانیش بڕوانن·

٥- با چاوەکانمان جیاوازی بکەن لە نێوان (ڕەش‌و سپی- جوان‌و ناشیرین- گەورەو بچووك- بەرزونزم)·

٦- با چاوەکانمان بە چاوی ڕێزەوە هەموو کەسێك لەیەك ئاستدا ببینن·

٧- چاو نیعمەتێکی خوای گەورەیە، هەرچەند خودای پێ نابینرێ لە دونیادا، بەڵام با هەست بە بوونی خودای گەورە بکەن‌و نیعمەتەکانی ببینن·

٨- با چاوەکانمان لەو کەسانە نەڕوانن کە لەخۆمان بەرزترن، ئەو کەسانە ببینین کە لە خۆمان نزمترن·

٩- با چاوەکانمان لەکاتی تاریکی یادی ڕووناکی بکەن، لە ڕووناکیشدا تاریکی لە یاد نەکەن·

١٠- با چاومان لەدەستی کەس نەبێت، تەنها دەستی خۆمان ببینین، هەرگیز چاوەڕێی پاداشت نەکەین·

١١- با چاوەکانمان لەسەر خامی سپی تەنها خاڵی ڕەش نەبینن، بەڵکو تەنها هەستیان پێ بکەن‌و بنبڕیان بکەن·

١٢- هەرگیز با بۆ بەرزی نەڕوانن پێش ئەوەی یەکەم پلیکانەی خانەی ژیان ببینن، با لە بەرزییەوە بۆ نزمی بڕوانن نەك بەرزتر·

١٣- با درۆ بە چاوەکانمان نەکەین کە شتێکمان دیبێ بڵێین نەمان دیوە، وە بە پێچەوانەوە·

١٤- چاوەکانمان وا فێربکەین کە هەموو کەسێك نرخی لێڕوانین‌و بینینی نییە·

١٥- بۆ هیچ کەسێکی زیندوو با فرمێسك نەڕێژن، چونکە ئەو کەسانەی ئێمەیان خۆش دەوێ هەرگیز نایەڵن بگرین·

١٦- با چاوەکانمان ئەوەبزانن کە گریان هیچ سوودی نییە، تەنها بۆ خاوێن کردنەوی چاوەکانمان فرمێسك بڕێژین·

١٧- با چاوەکانمان یارمەتی دەربن بۆ ئەندامەکانی تری لەشمان، بە تایبەتی گوێیەکانمان کاتێك کەسێك قسەمان بۆ دەکات·

١٨- بەر لە هاوسەرگیری با چاوەکانمان بە تەواوی کراوەبن دوای ئەوە با نیوەیان بنووقێنیین·

١٩- لە یەکەم بینیندا با کەس هەڵنەسەنگێنن، چونکە لەوانەیە چاوەکانمان هەڵە بکەن·

٢٠- هەڵبژاردنی هەمووشت سەرەتا بە چاو ئەکرێ، ئینجا ئەندامەکانی تر با ئەندامێکی لەشت جگە لە چاو ئەم ئەرکە لە خۆی نەگرێت مەبەستم دڵە·

٢١- با هەمیشە چاوەکانمان ئاگاداری ئەوەبن هەرچییەك درەوشایەوە زێڕ نییە·

٢٢- با چاوەکانمان ئەوە بزانن هەموو مرۆڤێك لەتێکە لە سێوێك، با هەوڵدەن بەدوای لەتەکەی تردا بگەڕێن·

٢٣- با چاوەکانمان تێربن لە دوای هەمووشت سەروەتو جوانی ببینن‌و هەڵی سەنگێنن·

٢٤- ڕاستە گوێز ڕووخسارێکی ساغو جوانی هەیە، بەڵام هەندێکجار کاکڵەکەی پوچە، با فێری ئەوە بن جوانی لە ناخدایە نەك لە ڕووخساردا·

٢٥- با چاوەکانمان لە شەودا تێر بخەون نەکا لە کاتی پێویست خەویان لێ بکەوێت·

# ژنە میهرەبانەکە

و/راز هەڵەبجەیی

ئـەو ڕۆژەی کـە بڕیاربـوو بڕۆمەوە بۆ سـەرکار بڕیارمدا ڕاسـتییەکە بە باوکم کە -جگـە لە ئەو هیچ کەسـێکم نییـە- بڵێم، باوکـی بێچـارەم تـا ئـەو ڕۆژە وای دەزانی من هێشـتا هـەر کچە بچکۆلەکـەی جارانم، لـە کاتێکدا کـە نزیکـەی دوو هەفتە دەبوو لەگەڵ کوڕێك ببوومە هاوڕێ! من سـەبارەت بـە کارەکەم درۆم لەگەڵ باوکم کردبوو، پێم وتبـوو لە ڕێگـەی ئـاگاداری ڕۆژنامەوە ئەم کارەم پەیـدا کـردووە، بەڵام ڕاسـتییەکەی ئەوەبوو کە (سـوبحان) ئەو کوڕە بوو کە ئەم کارەی بۆ دۆزیبوومەوە، هەر بەو جۆرەی کە بەدیار باوکمەوە حەپەسـابووم دەسـتم کرد بە گریانو سـەرم خسـتە سەرشـانی باوکم لـە کاتێکدا کە دەسـتی بە سـەرمدا دەهێنا وتی: قسە بکە کچە تاقانەکەم··· دڵنیابە من یارمەتیت دەدەم جەمیلە···مەترسە کچم···

منیش کە بە قسەکانی باوکم هێزێك لە دڵمدا دروسـت بوو، هەموو شـتێکم هەر لە یەکەم ڕۆژەوە بۆ گێڕایەوە···

یەکەمجار بەم شێوەیە بە سوبحان ئاشنا بووم، خۆشم کەمێك تاوانبار بووم، ئەو ڕۆژە ئاگادارییەکـی دامەزراندنم لە ڕۆژنامەیەکدا بینیبوو، بۆ قسـەکردن لەگـەڵ بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە بەرەو ئەوێ دەڕۆشتم· شوێنەکە لـە شـەقامێکی لاوەکییـەوە تێپـەڕ دەبوو ئەوەنـدە چۆڵ بوو کە هیچ تەکسـییەك یان کەسێك کە سەفەر بکات لەو ناوەدا نەدەبینرا، نیـو کاتژمێر چاوەڕێ بووم، کاتێك کە زانیم خەریکـە کات درەنگ دەبێـتو لەوانەیە لە کاتـی خۆیدا نەگەمە ئـەوێ، دڵم کردە یەك دڵو دەسـتم بۆ ئوتۆمبێلێکـی مۆدێل بەرز ڕاگرت، شۆفێرەکەش یەکسەر ڕاوەستاو منیش سـەرکەوتم، بە پێچەوانەی ئەوەی کە بیرم لـێ دەکردەوە، وام زانی کە ئەو کوڕە جوانو خۆش قیافەیە یەکسەر دەست بە قسە کردن دەکاتو مێشکی سەرم دەبات، جگە لەوەی کە پرسـی بۆ کوێ دەچم، منیش مەبەسـتەکەم تێگەیانـد، ئیدی یەك وشـەی تـری لەگەڵ نەگوتم، هەر ئەو ڕەفتارەشی وای لێکردم کە متمانەی پێ بکەم، سـوبحان دوای ئەوەی کە منی گەیاندە بەردەم کۆمپانیاکە وتی:

ئەم جـۆرە کۆمپانیایانە یان موچەیەکی کـەم دەدەن یان ئەگەر موچەیەکی باشـیش بدەن شتێکی تریان لە ژێر سەردایە، هەڵبەت ئومێدەوارم ئەمەیان جیاوازبێت، بە هەرحاڵ هیوای سەرکەوتنت بۆ دەخوازم·

ڕاسـتیتان بووێت بـە ڕەفتارەکانی زۆر کاریگەر بووم، دوای ئەوەی کە پێشبینیەکەی سـوبحان ڕاسـت دەرچوو، چونکە موچەکەی بە زۆر بەشی کرێ تەکسـیو خواردنەکەمی دەکرد! کاتێك کە لە کۆمپانیاکە هاتمە دەرەوە سوبحان لە ناو ئوتۆمبێلەکەیدا چاوەڕێم بوو، هەر کە بینیمی وتی:

نیگـەران مەبـە، بە ڕووخسـارتدا دیارە کـە قسـەکەی مـن ڕاسـت دەرچـوو، بەڵام خۆشبەختانە من بەم نزیکانە خەریکی دانانی نوسـینگەیەکم بۆ ئەو کۆمپانیایەی کە خۆم بەڕێوەی دەبەم، پێویسـتم بە سکرتێرەیەك هەیە بە مووچەیەکی باشو···

هەربەم شێوەیە بڕیاربوو دوای دوو ڕۆژ بڕۆم بۆ کۆمپانیاکەی ئەو، هەر ئەو کارەشم کرد، بەڵام سکرتێرەکەی ئەوێ ژنێکی گەنجی باڵا پۆش بوو، زۆر بە ساردییەوە قسەی لەگەڵ کردم، کاتێك کە ئەمەم بە سوبحان وت ئەو وتی:

ئەو حەسـودی لێ دێت کـە ئەو نابەمە ئەو کۆمپانیایە···

هـەر چۆنێـك بوو لـە سـبەینێی ئەو ڕۆژەوە من هەموو دوای نیوەڕۆیەك دەچووم بۆ کۆمپانیا تا سوبحان بەشەکانی کارەکەمم پێ بڵێتو فێرم بکات، بەڵام هەر لەدانیشتنی سـێهەمدابوو کە ئەو بەڕەسمی عاشق بوونی خـۆی ڕاگەیاندو وتی: -جەمیلە من دەمەوێ دوو تـا سـێ مانـگ دوای ئـەوەی کارەکانی کۆمپانیاکەمـم ڕاپەڕانـد زەماوەندت لەگەڵ بکەم، چونکە من عاشقت بووم·

لـە مـاوەی دوو هەفتەدا هەمـوو ڕۆژێك سـوبحانم دەبینیو لەم دیدارانەشـدا ئەوەندە هۆگری سوبحان بووبووم کە کارەکەمم پشتگوێ خسـتبوو، هەرچەندە هێشـتا دوو مەسـەلەم بـە بەبێ وەڵامی لە بەردەمـدا بوو، یەکەمیان ئەوەی کە بۆچی سوبحان دەی وت ئەم دوو سێ مانگە تۆ دەبێت هەر لەم کۆمپانیایە کاربکەیت خۆ بڕیاربوو من ببمە هاوسەری ئەو!

دووەمیشـیان پەیوەنـدی بـە خاتوونی سکرتێرەوە هەبوو، خۆ ئەو ژنێکی بە ئیمانو تێگەشـتوو بـوو، زۆربـەی کات بـە قورئان

خوێندنەوە سەرقاڵ بوو، ڕۆژبەڕۆژ ڕەفتاری لەگەڵ من ساردتر دەبوو، بەڵام هەرچۆنێك بوو تەحەمولم دەکرد تا بە زوویی بڕۆمە کۆمپانیا نوێیەکەو دەست بەکارەکەم بکەم، کاتێك کە ئەمانەم بە باوکم وت، چەند خولەکێك سەرقاڵی بیرکردنەوەبوو، دوای ئەوەی کە ژمارەی کۆمپانیا نوێیەکەی سوبحانی وەرگرت، تەلەفۆنی کرد بۆئەوێو بە خاتوونی سکرتێرەی وت:

کچم من باوکی جەمیلەم، ئەو دەربارەی تۆ هەندێ شتی پێ وتووم، دەزانم ژنێکی ئیمانداری، لەبەرئەوە بەو قورئانەی کە دەیخوێنیت سوێندت دەدەم هەرچییەك دەربارەی سوبحانو ئەو پێشنیاری زەماوەندەی کە بەکچەکەمی داوە دەزانی پێم بڵێ...

ژنە گەنجەکە کەناوی لەیلا بوو دوای ئەوەی کە باوکمی سوێندا کە هیچ شتێك بە سوبحان نەڵێت وتی: ئەمە فێڵی سوبحانە، ئەو هەر بەوشێوەیە هەرچەند مانگ جارێك کچانێك کە سەرەتا داوای خۆشەویستییان لێ دەکات لە نوسینگەیەکدا دایان دەمەزرێنێو دوایش بە بیانووی ئەوەی کە دەیەوێ زەماوەند بکات ئەوان هەڵدەخەڵەتێنێ، هۆکاری ئەوەش کە من بەو شێوەیە ڕەفتارم لەگەڵ کچەکەی ئێوەدا دەکرد ئەوەبوو کە ڕۆژێك کچەکەتان هۆکاری ئەو ڕەفتارانەمم لێ بپرسێت تا منیش ئەم شتانەی پێ بڵێم! لەوانەیە ئێوە لە خۆتان بپرسن کە من بۆچی لەگەڵ ئەم گورگەدا کاردەکەم؟ ڕاستییەکەی ئەوەیە کە سوبحان برای منەو من تەنها لەبەرئەوە لێرە کاردەکەم تا ئەو نەتوانێ مافی منو دایکمو دووبرا بچووکەکەم کە دوای مردنی باوکم لەم کۆمپانیایە بەشمان هەیە پێشێل بکات! ئەوەش بۆ ئەو بەسە کەبزانێت من ئەم قسانەم کردووە ئەو کات یەکسەر لێرە دەرم دەکات...

دوای تەواو بوونی قسەکانی لەیلا باوکم پێی وت:

کچم ئومێدەوارم هەر بەو شێوەیەی کە بوویتە هۆی پاراستنی ئابڕووی کچەکەی من، خوای گەورە ئابڕوی تۆش بپارێزێت!

زۆر حەزم دەکرد دوو قسە لەگەڵ سوبحاندا بکەمو پێی بڵێم باش زانیم چیت لە ژێر سەردایە...بەڵام ئەو بەڵێنەی کە باوکم بە لەیلای دابوو ڕێگربوو لەبەردەممدا، تەنها بەبیانوویەکی بچووك بۆ هەمیشە لێی دوورکەوتمەوە، ئێستاش هەمیشە سوپاسی خوا دەکەم کە لەیلای لەسەر ڕێگاکەم داناو پێش ئەوەی درەنگ ببێت نەیهێشت ئابڕووم لە کەدار ببێت٠ بۆیە هەتا مردن خۆم بە قەرزاری خاتوو لەیلا دەزانم!!!

گۆڤاری روزهای زندگی/ ژ۰۳۱۲۰



# پەلە مەکە!!

و: محمد عەولا میرگەیی

دەگێڕنەوە جارێکیان پیرە پیاوێك لەگەڵ کوڕەکەی کە تەمەنی ٢٥ ساڵان دەبێت لەناو شەمەندەفەرێکدا دانیشتبوون، کە دەیانویست بگەڕێنەوە ماڵەوە، کوڕەکەی لە تەنیشت باوکی دانیشتبوو زۆر بەخۆشحاڵییەوە لە پەنجەرەکەوە سەیری دیمەنەکانی دەرەوەی دەکرد لە ناکاو بە سەرسوڕمانەوە بە باوکی وت: (باوکە تەماشای ئەم دارو درەختە بکە، وەك ئێمە دەڕۆن!!) باوکیشی بە زەردەخەنەیەکەوە سەرێکی لە قاندو خۆشحاڵ بوو بە قسەی کوڕەکەی٠ لە نزیك ئەوان ژنو مێردێك دانیشتبوون هەستیان بە کەمێك شەرمەزاری کرد، چۆن گەنجێك بەو تەمەنە ئەو قسەیە دەکات زۆر لایان سەیر بوو؟!

پاش کەمێکی تر لە ڕۆیشتن گەنجەکە دیسان بە سەرسامییەوە وتی: (باوکە باوکە سەیری ئەم گۆمە ئاوەکە لەوبەر، سەیری هەورەکانی ئاسمان بکە، ئەوە خەریکن لەگەڵ ئێمە دەڕۆن) دیسان ژنو مێردەکە سەیریان بە وتەکانی گەنجەکە هاتو جۆش دامابوون؟؟؟

دیسان دوای کەمێك لە ڕۆیشتن بینی وا چاوی بە مانگ کەوت لە ئاسمان دیسان بەسەرسامییەوە ڕووی لە باوکی کردو وتی: (باوکە سەیرکە مانگیش خەریکە لە گەڵمان دێت؟؟) ئیتر ژنو مێردەکە خۆیان پێنەگیراو یەکسەر ڕوویان لە باوکی گەنجەکە کردو وتیان: (پێناچێت کوڕەکەت تەواو بێت بۆ سەردانی پزیشکێکی دەروونی پێناکەی؟؟) پیرەپیاو زۆر بە ئارامییەوە وتی: ئەوە ئێستا لای پزیشکی چاو دێینەوە نەشتەرگەری چاوم بۆ کردووە، چونکە ئەو لە زگماکەوە هەردوو چاوی کوێربوو، تازە چاوەکانی بە دونیا شاد دەبن!!!

لەبەرئەوە زۆر پێویستە تاکو تەواو لە کەسانی دەوروبەرمان نەگەین بە ئارەزووی خۆمان حوکمیان لەسەر نەدەین٠

سەرچاوە/ ئینتەرنێت٠



# هەشت ئامۆژگاری بەسوود

ئا: بڕوا حمە کەریم – زانکۆی کۆیە

کابرایەك هەبوو ناوی (حاتم الاصم) بوو، لـە برادەرە نزیکەکانی شـەقیقی بەڵخی بوو، رۆژێکیان شەقیقی بەڵخی پێی وت: تۆ ئەوە سێ ساڵە هاوڕێیەتی من دەکەیت، چ سوودێکت لەم ماوەیەدا بینیوە؟ ئەویش وتی: هەشت سوودم بینیوە، ئەو هەشـتـەش بـۆ ئەوەیە پێیانەوە رزگار بم.. شەقیقیش وتی: ئەو هەشت سوودە چییـە؟ حاتەمیش وتی: سـوودی یەکەم: من تەماشـای خەڵکیم کـرد، بینیم هـەر یەکێ خۆشەویسـتێكو هاوڕێیەکی هەیە کە خۆشی دەوێـتو لەگەڵی دایە تـا دەگاتە گۆڕەکەی... لەوێـدا لێی جیادەبێتـەوەو لەگەڵی ناڕوات! منیـش بیرم لە چاکترین دۆسـت کردەوە کە لە ناو گۆڕیشـدا هـاودەمو هۆگرم بێتو جێم نەهێڵێـت، گومانیشـی تێـدا نییە ئـەو تاکە دۆسـتەی لە تاریکی گۆڕیشدا جێمان ناهێڵێت ئەو کردەوە چاکانەن کە خۆشەویسـتی منو چرایەکـن بۆ مـنو پێیانەوە شـاد دەبمو بە تەنیایی بەجێم نایەڵن.

سـوودی دووەم: بینیم وا خەڵکی بەدوای شـەهوەتو ئارەزووی خۆیان کەوتوونو هیچی تریـان بە خەیاڵدا نایەت... منیش ئەم ئایەت پیرۆزەم هاتەوە یـاد کە دەفەرموێ: (وأما من خاف مقـام ربه ونهى النفس عـن الهوى فان الجنة هى المأوى) واتا: ئەوەی لە خوا بترسێو بەسـەر شـەهوەتو ئارەزووی خۆیدا زاڵ بێ، شـوێنی ئەو کەسـە بەهەشـتەو لەوێ شـاد دەبێتەوە.. بەمـەوە بۆم دەرکەوت کە قورئان ڕاست دەفەرموێو منیش دەبێ بە پێچەوانەی نەفسـی خـۆم ڕەفتار بکـەم... بۆیـە منیش جڵەوی تێکۆشانم بە دەستەوە گرتو دەسەڵاتی خۆم بەسەر نەفسـمدا زاڵ کرد، تاوام لێ کرد ملکەچی فەرمانەکانی خوای گەورە بێ.

سوودی سـێیەم: سەیرم کردو بینیم هەر یەکـێ وا هەوڵ دەداتو تێدەکۆشـێ بۆئەوەی ماڵ بـۆ خۆی کۆبکاتـەوە، منیش بیرم لەم ئایەتە کردەوە کە دەفەرموێ: (ماعندکم ینفد ومـا عندالله بـاق)، واتا: ئـەوەی لای ئێوەیە تـەواو دەبـێو دەبڕێتەوە، بـەڵام ئەوەی لای خوایـە تەواو نابێو نابڕێتەوە... بۆیە منیش ئەوەی هەم بوو لە ڕێی خوادا بەسـەر هەژارو بێ دەسـەڵاتاندا دابەشـم کرد، تا بەمەوە لە لایەن خوا گەنجینەیەك بۆ خۆم بڕەخسـێنم، بۆئەوەی لە ڕۆژی قیامەتدا فریام کەوێ.

سوودی چوارەم: هەندێ کەسی وام بەرچاو کەوت، کە بەلایەوە شەرەفو پایە بەرزی لەوە دایـە یەکێ قـەومو قیلەیەکـی زۆری هەبێو شـانازییان پێوە بکا، هەندێکیان وایان دەزانی شـەرەفو پایە بەرزی لـەوە دایە یەکێ ماڵو منداڵێکی زۆری هەبێو شـانازییان پێوە بکا.. هەندێکیان وایان دەزانی شەرەفو پایە بەرزی لەوەدایە یەکێ ماڵی خەڵکی تاڵان بکاو زوڵمو خوێـن ڕێژی بـکا... هەندێکی تریـان وایان دەزانی شـەرەفو پایە بەرزی لەوە دایە یەکێ ماڵـی خۆی پەرتو بڵاو بکاو خۆشـی نەزانێ چۆنی ببەخشـێ. منیـش بیرم لـەم ئایەتە پیـرۆزە کردەوە کە پـەروەردگار دەفەرموێ: (ان أکرمکم عند الله أتقاکم)، واتا: بەڕێزترین کـەس لای خـوا، ئـەو کەسـەیە زۆر لە خوا بترسـێ... بۆیـە منیش لە خوا ترسـانم بۆ خۆم هەڵبژاردو باوەڕم هێنا کە قورئان ڕاست دەفەرمـوێ، سـەرچاوەی هەمـوو کامەرانیو خۆشبەختییەك هەر لای خوایە.

سـوودی پێنجەم: بینیم خەڵکی وا زەمی یەکتری دەکەنو پاشـملە لـە یەکتر دەدوێن، منیش زانیم ئەمەیان لەبەر چاو تەنگیەوەیەو خەم لەیەکتر دەخۆن... بۆیە چاویان بڕیوەتە ماڵو پایەو زانستی یەکتری، منیش بیرم لەم ئایەتە پیرۆزە کـردەوە کە دەفەرموێ: (نحن قسـمنا بینهم معیشـتهم فی الحیـاه الدنیا). واتا: بە پێی ویسـتی خۆمان ماڵو سـامانمان لە ژیاندا لە ناو خەڵکیدا دابەش کردو کەسی تر هەقی بەسـەر نیە... بۆیـە منیش زانیم بەشکردنی هەموو شـتێك لە لایەن خواوەیە، ئەمیـش لە ئەزەڵـەوە بۆی ڕەخسـاندووین، لەبـەر ئەمە بەرچاوم تەنگ نەبوو خەمم لە هیچ شـتێ نەخواردو، بەم بەشـەی خوا پێی دابووم ڕازی بووم.

سـوودی شەشـەم: بینیم خەڵکـی وا لەبەر چەنـد هۆیـەك دوژمنـداری لەگـەڵ یەکتـری دەکـەنو منیش بیرم لەم ئایەتەی خودا کردەوە کـە دەفەرموێ: (ان الشـیطان لکم عدو فاتخذوه عدوا)، واتە: شەیتان دوژمنی ئێوەیە، ئێوەش بە دوژمنـی دابنێن... بۆیە منیـش زانیم کە نابێ جگە لە شەیتان دوژمنداری لەگەڵ کەسدا بکەم.

سـوودی حەوتـەم: بینیـم هـەر یەکێ بـەو پـەڕی تواناو کۆششـیەوە وا هەوڵ دەدا بۆئـەوەی هەر چۆنێك بـێ نانێك پەیدا بکا، لـەڕادە بەدەر خـۆی دەخاتـە دوای حەرامو گومـانو چاوی خۆی نزم دەکاتەوەو بە جارێ نرخی خـۆی دێنێتە خـوارەوە. منیش بیرم لـەم ئایەتە کردەوە کـە دەفەرموێ: (وما من دابـة فی الارض الا علی الله رزقها) واتە: هەر گیانلەبەرێـك کەلـە زەویدا خـول بخواتەوە ئەوە رزقی لەسەر خوایەو ماتەڵ نابێ... بۆیە منیش کە زانیم رزق لەسـەر خوای گەورەیە، ڕووم لە خوا کردو تەنیا چاوم بڕییە ئەو.

سوودی هەشتەم: بینیم هەریەکێ پشتی بە شتێ بەستووە، یەکێ بە دینارو درهەم، یەکێ بەماڵو موڵك، یەکێ بە پیشـەو پیشەسـازی، یەکێ بـە ئادەمیزادێکی وەکـو خۆی. منیش بیرم لەم ئایەتە کردەوە کە دەفەرموێ: (ومن یتوکل علی الله فهو حسبه ان الله بالغ أمره قد جعل الله لکل شیء قدرا) واتا: ئەوەی پشت بە خوا ببەستێ، ئەوەندەی بەسە، خواش ئەوەی بیەوێ جێبەجێی دەکاو، حیسابێکی تایبەتیشی بۆ هەموو شتێك کردووە ڕادەیەکی بۆ داناوە. بۆیە منیش پشـتم بەخوا بەستو هەر ئەوم بەسە، ئەویش چاکترین پارێزگارە.

شـەقیقی وتـی: خـوا دەسـت بـە باڵی تەمەنتـەوە بگرێ، ئەو هەشـت سـوودەی بۆ منت وت، هەر هەشـتیان لـە کتێبی تەوراتو ئینجیلو زەبوورو قورئاندا باسیان لێوە کراوە، هـەر یەکێکیش جێبەجێیان بـکا مانای وایە فەرمانەکانی خودای جێبەجێ کردووە.



# خەسووی نموونەیی!

و: هێرۆ موحەممەد ئەڵماس

ئەگەر کوڕەکەت یاخود کچەکەت لەگەڵ هاوسەرەکەیدا شەڕو دەمەقاڵەیان کرد، خۆت گێل بکەو نە ببیستەو نەقسەش بکە، خۆت لە شەڕوهەراکە دوور بخەرەوە، تاوەکو دونیا وەك ماستی مەییوو ئاشی بێ ئاوی لێدێتو بارودۆخەکە ئاسایی دەبێتەوە.

ئایا کوڕەکەت یاخود کچەکەت پەیوەندیو خزمایەتیان لەگەڵ خێزانو بنەماڵەیەکی عەجیبو غەریبدا ئەنجامداوە؟ مەبەستم ئەوەیە کە ئایا شێوازی ژیانیان لەگەڵ ئێوەدا جیاوازە؟ ئایا دابو نەریتو فەرهەنگی خێزانییان بە لای ئێوەوە نامۆو نەناسراوە؟ ئایا خزمو کەسی گرنگو ناوداریان هەیە؟ ئایا ئاکارو ڕەوشتیان لە ناو کۆمەڵگەدا پەسەندو گونجاوە؟

ئەگەر بەم شێوەیەیە ئەوا باشتر وایە کە خۆت دوور بگریتو تۆپو ساحەکە بە بووکو زاواکەتان بسپێرن، ئەگەر ئەوان لە بارەی ئەوەوە قسەیان دەکرد کە هەفتەی داهاتوو لە چ شوێنێك "سێرك" ئەنجام دەدرێت؟ یان فلانە دۆسییە گەیشتووەتە کوێ؟ ئەوا مۆڵەت بدەو بهێڵە با خۆیان بابەتەکە باس بکەن، لەوانەیە فزولی کردنو خۆهەڵقورتاندن لە کاروباری ئەوان وەك خۆرە بەربووبێتە گیانتان، بەلام هەوڵ بدەن کە ئیرادەتان لە دەست نەدەن، فزوڵیو خۆ هەڵقورتاندن واتە ئەوەی کە پرسیارێکتان لێ بکەن کە حەز نەکەنو پێتان خۆش نەبێت وەلامی بدەنەوە، لەم جۆرە کاتانەدا بە دیدو تێڕوانینێکەوە تەماشای مەسەلەو بابەتەکە بکەن کە نیشاندەری عیشقو خۆشەویستی بێت.

### ئەو تەلەفۆنە پێویستانەی کە پێویستە بۆ بووکو زاوا بکرێن.

* کاتێك یەکێك لە ئەندامانی بووك یان زاواکەتان نەخۆشە، تەلەفۆنێکی بۆ بکەنو بڵێن: "من چیم پێدەکرێو دەتوانم چیت بۆ بکەم" ئەم تەلەفۆنەت هیچ زەرەرو زیانێکی نییە.
* کاتێك تاقیکردنەوەی هەیە، تەلەفۆنێکی بۆ بکەنو بڵێن: هیوادارین سەرکەوتوو بیت.
* کاتێك زاواکەتان پۆستو پلەی بەرز دەبێتەوە، تەلەفۆنی بۆ بکەنو پیرۆزبایی لێ بکەن.
* کاتێك میوانییەکی گەورەتان بۆ ڕێکدەخەن، ڕۆژی دواتر تەلەفۆنیان بۆ بکەنو سوپاسی بکەن.
* کاتێك زاواکەتان نەخۆشە، تەلەفۆنی بۆ بکەنو پرسیاری لێ بکەن کە ئایا پێویستی بە هیچ شتێك نییە؟
* کاتێك میوانتان هەیەو بووکەکەتان یارمەتیتان دەدات، ڕۆژی دوایی تەلەفۆنی بۆ بکەنو سوپاسی بکەنو پێی بڵێن: کە بە بوونی ئەو ئیشو کارەکان چەند ئاسان بەڕێوەچوون.
* کاتێك زاواکەتان بە شێوەیەکی نائاسایی ڕێزی لە یەکێك لە ئەندامانی خێزانەکەتان گرت "بۆ نموونە سەردانی خزمێکی نەخۆشتانی کرد" ئەوا تەلەفۆنی بۆ بکەنو بڵێن: چەند کەسێکی ورياو هۆشیاریت.
* ئەگەر بووکەکەتان لە کاتی نەخۆشیتاندا ئیشو کارەکانتان بۆ ئەنجام دەدات، تەلەفۆنی بۆ بکەنو سوپاسی بکەن.
* کاتێك زاواکەتان بە ئۆتۆمبێلەکەی خۆی دەتانبات بۆ شوێنێك، دواتر تەلەفۆنی بۆ بکەنو دووبارە سوپاسی بکەن.
* کاتێك بووك یان زاواکەتان داواتان لێدەکەن کە ڕۆژی پشوویان لەگەڵ بەسەربەرن، دوای ئەوەی کە گەڕانەوە بۆ ماڵەوە، تەلەفۆنیان بۆ بکەنو بڵێن کە چەند ڕۆژێکی خۆشتان لەگەڵ ئەواندا بەسەر برد.
* ئەگەر پشووی کۆتایی هەفتەیان لە ماڵی ئێوە بەسەربرد، تەلەفۆنیان بۆ بکەنو بڵێن چ ساتێکی خۆشتان لەگەڵ ئەواندا بەسەربردووە؟
* کاتێك بە بۆنەی جەژنەکانەوە کارتی پیرۆزباییتان بۆ دەنێرن، بە تەلەفۆن سوپاسیان بکەن کە لە بیرتاندا بوون.
* کاتێك بە بۆنەیەکەوە دیاریتان بۆ دەهێنن، تەلەفۆنیان بۆ بکەنو بڵێن تا ئێستا دیارییەکی لەو شێوەیەتان وەرنەگرتووە.
* کاتێك بووکەکەتان بۆ ماوەی ڕۆژێکی تەواو هاوسەرەکەی بە قەرز دەدات بە ئێوە بۆ ئەوەی کارێکتان بۆ ئەنجام بدات، تەلەفۆنی بۆ بکەنو بڵێن: چەند سەخاوەتمەندیت کە مێردەکەی لەگەڵ ئێوەدا بەشداری دەکات.
* کاتێك زاواکەتان خولێك تەواو دەکات، تەلەفۆنی بۆ بکەنو سەرکەوتنی لێ پیرۆز بکەن.
* کاتێك بووکەکەتان پۆشاکەکانی خۆیتان پێ دەبەخشێت لەبەرئەوەی کە حەزتان لێکردووە، تەلەفۆنی بۆ بکەنو بڵێن کە تۆ زۆر میهرەبانیت.
* کاتێك یەکێك لە خزمەکانی بووکەکەتان یان زاواکەتان دەمرێت، یەکەم کەسبن کە تەلەفۆنی بۆ دەکەن.
* کاتێك بووکەکەتان یاخود زاواکەتان منداڵەکانیان هاندەدەن یاخود ناچاریان دەکەن کە چاکەیەکتان لەگەڵدا ئەنجام بدەن، تەلەفۆنیان بۆ بکەنو پێیان بڵێن: کە منداڵەکانیان چەند خۆشبەختو بەختەوەرن کە دایكو باوکێکی لەم شێوەیەیان هەیە.
* کاتێك بووکەکەتان تا عەیادەی پزیشك لەگەڵتان دێتو هاوڕێیەتیتان دەکات، دواتر تەلەفۆنی بۆ بکەنو بڵێن: هاتنی ئەو لەگەڵتاندا چەندێك کاریگەر بووە؟
* کاتێك بووکەکەتان شێوازی ئامادەکردنی خواردنێکتان فێردەکات، دوای دروستکردنی خواردنەکە تەلەفۆنی بۆ بکەنو پێی بڵێن: کە خواردنەکە چەند باشو خۆش دەرچووە؟

سەرچاوە/ گۆڤاری "بانوی شرقی" ژمارە (١٨).

(جی. ئیس. سۆلت)

# چۆن دەبیتە هاوسەرێکی نموونەیی؟

بەشی چوارەم

بۆ ژنان

**نورمان ٣٢ سال، ٥ سالە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** کاتێك هەست بە دڵتەنگیو ناخۆشی دەکەیت، پێم بڵێو لە ناخی خۆتدا مەیشارەوە تا نەبێتە بۆمبێكو لە دواییدا بتەقێتەوە.

**کیفن ٤٢ سال، ١٩ سالە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** کاتێك لە بێتاقەتیو بێزاریت دەپرسم هۆکارەکەیم پێ بڵێو مەڵێ (هیچ نییە)، پاشان پێت وایە کە بیخەملێنم منم هۆکاری بێزاریت.

**ئەلبەرتۆ ٣٤ سال، خێزانی تەلاق داوە:** بە باشی گوێ بۆ هاوسەرەکەت بگرە لە کاتێکدا کە هەستەکانی دەردەبڕێتو لەناخی خۆی دەدوێت... ئەگەر ئەو هەستانە لە ناخیدا کەڵەکە ببن ئەوا بە پێی کات دەبێتە هۆی کێشەیەکی گەورە.

**جیف ٤٣ سال، ١٧ سالە خێزاندارە:** زۆر خۆشحاڵو ئاسوودەم کاتێك دەتبینم گوێم بۆ دەگریتو گرنگی دانی خۆتم بۆ دەردەخەیت، هەروەها کاتێك چەند بۆچوون یان روانینی جیاوازت هەیە.

**ئەلین ٤٣ سال، ٢ سالە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** تکایە وا دامەنێ کە من بەگرنگییەوە بیر لە هەموو شتێ دەکەمەوە پێش ئەوەی بیدرکێنم، بۆیە زیادەڕەوی مەکە لە ئاگادارکردنەوەم بەوەی هەڵەم لە هەڵبژاردنی وشە یان شتێك دەڵێم بووەتە مایەی وروژاندنت.

**جای ٦٢ سال، ٣٠ چۆتە نێو ژیانی هاوسەرگیرییەوە:** واز لە هەوڵەکانت بهێنە بۆ تەواوکردنی دەربڕینەکانم، بزانە لە ناخمدا تەکەبوری منداڵێکی تێدایەو پێویستە کە رای سەربەخۆی خۆمم هەبێت.

**دان ٧٥ سال، ٥٣ سالەچۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** هەوڵ بدە فێربیت جیاوازی بکەیت لە نێوان گوێگرتنو تێگەیشتن، دەزانم هەندێ کات گوێم بۆ دەگریت، بەڵام ئەپرسم ئایا لێم تێگەیشتی؟

**ستیوارت ٣٧ سال، ٧ سالە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** کاتێك پێشنیارێکم دەبێتو تۆش رەتی دەکەیتەوە، ئاسایی دەبێت، بەڵام کاتێك کەسێکی تر هەمان پێشنیاری دەبێت زۆر پێت خۆش دەبێتو دەڵێیت ئاه لەو بیرۆکە جوانە!

ئەوە وام لێ دەکات هەست بەوە بکەم بیرۆکەکانم پشتگوێ دەخەیتو خۆشم بە هەمان شێوە.

**چارلز ٣٤ سال، ٦ سالەچۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** هەوڵ بدە سەرەتا لێم تێ بگەیت لەوەی دەیڵێمو بە باشی وەری بگریت، پاشان هەوڵبدە وام لێ بکەیت کە لێت تێ بگەم.

**جیری ٥٣ سال، ٥ سال هاوسەرگیری دووەم:** کاتێك لە تۆوە نابینم بێجگە لە سکاڵاکردنو پەرچ دانەوەی نەرێنی وا هەست دەکەم من بێگومان خراپترین هاوسەرم لە جیهاندا. هەوڵ بدە هەندێ لە کاتەکانت بە وتنی لایەنە باشەکان کە لە کەسایەتیمدا دەبینیت بەسەربەریت. شێوازو هەڵسوکەوتم لەگەڵ منداڵەکانم پێ رابگەیەنە، چۆن من دەتوانم بەختەوەرت بکەم؟ چۆن دەتوانم ژیانت خۆشو ئاسودە بکەم؟ ئەو ئاکارە جوانانە کامانەن لە کەسایەتیمدا دەیبینیت؟ لە کۆتاییدا: هەوڵ مەدە تەنها کەمو کورتیەکانم دەربخەیت، بەڵکو قسە لەسەر چاکەو لایەنە باشەکانم لە کەسایەتیمدا بکەیت.

**جیرارد ٢٩ سال، تەلاق دان پاش هاوسەرگیرییەکی ساڵو نیوی:** گرنگی بە هاوسەرەکەت بدە، با لێتەوە گوێبیستی وشەو دەربڕینی جوانو ستایشەکانت بێت، رەخنەی لێ مەگرەو توند مەبە لە گەڵی، لەوانەیە ئەو بە بێگومان خاڵە لاوازەکان بزانێت.

**دیک ٦ سال ٤٣ چۆتە نێوژیانی هاوسەرییەوە:** دەربڕینی «پێم وتی ئەوە روودەدات» بە وتن یان جوڵەی لەش نابێتە شتێکی بەرهەمدار لە بنیاتنانی پەیوەندی باش لەگەڵ هاوبەشی ژیانت.

**نیك ٥١ سال، ٢٤ سال هاوسەرگیری دووەم:** مەترسە لە هەر موناقشەیەك یان هەر گفتوگۆیەك کە لە بەردەم منداڵەکانماندا روودەدات، چونکە لە ماوەی تێکچوونو راجیاوازەکانمانەوە فێر دەبن چارەسەر بوون هەیە، بە هۆی رێزی ئاڵوگۆڕو شێوازی جوان لە نێوان هەردوولادا. لەو کاتەشدا منداڵەکانت دەڵێن: باشە، گفتوگۆبکەینو رای جیاوازمان هەبێت، بینیمان دایكو باوکمان ئەو جیاوازییەیان بەشێوازێکی راست کۆتایی پێهێنا.

**دیك ٦٤ سال، ٢٤ سالە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** بیخەرە مێشکتەوە هەمیشە زۆر لە شتەکان کە گفتوگۆیان لە سەر دەکەیت تایبەتنو نهێنین پێویست ناکات کەسی تر بیانزانێت.

**لی ٦١ سال تەلاق دان:** دەربارەی ئاکارو هەڵسوکەوتە خراپەکانم بە هاوڕێکانت مەڵێ.

**جول ٤٧ سال، ٥ سالە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** تکایە دەربارەی پسوڵەی باجو پارەدان پێش کاتی خەوتنم قسە مەکە، چونکە وام لێ دەکات نەتوانم بە ئاسانی خەوم لێ بکەوێت.

# چۆن دەبیتە هاوسەرێکی نموونەیی؟

(جێ. ئیس. سوَت)



بەشی چوارەم

**بۆ پیاوان**

**فیلیس (٥٥) ساڵ، (٢٥) ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** بەتەواوی تەماشام بکە، پێش ئەوەی پێم بڵێی تۆ جوانی.

**کیت تەڵاق دراوە، دوای هاوسەرگیرییەك کە (٢٣) ساڵی خایاندووە:** کاتێك دەبینی تەماشای رووخساری لە ئاوێنەدا دەکاتو ترس دایدەگرێ بە بینینی ئەو چرچولۆچییەی کە خەریکە دەمو چاوی دادەگرێ، پێی مەڵێ کە باش وایە نەشتەرگەرییەکی توندکردنەوەی رووخساری ئەنجام بدات، بەڵکو ئەوەی ئەو پێویستی پێی هەیە ئەوەیە کە پێی بڵێیت: «خۆشەویستەکەم من شێتی ئەم رووخسارە کەمەند کێشەتم».

**تراسی- (٧) ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** هەرگیز باسی مەسەلەی قەڵەوی مەکە.

**بیجی (٤٧) ساڵ:** پێویستە بەردەوام بە بیرم بێنیتەوە کە هاتنە خوارەوەی ورگو زیاد بوونی شتێکی ناقوڵا نییە، بەڵکو بەڵگەیەکی لەبەرچاوە لەسەر ئەوەی کە من چاوی سێ گوڵەباخم بەم ژینە هەڵهێناوە.

**کارین (٣٩) ساڵ، (١٥) ساڵە هاوسەرگیرە:** بەردەوام مەدحم بکەو بە سیماو باڵامدا هەڵبدە، چونکە تێبینیو سەرنجەکانت بۆ من زۆر دەگەیەنێ.

**کات ٤٠ ساڵ:** کاتێك لەوپەڕی تورەیی دام، ناتوانم لێت تێبگەمو گوێت بۆ بگرم، ئەو کاتە من لە هەموو کات زیاتر پێویستم بەوەیە کە دەست بخەیتە سەرشانمو لە ئامێزی خۆتم بگری، ئەم باوەشە پڕ لە سۆزەت هەموو ئەو شتانە دەتوێنێتەوە کە دەبنە مایەی تورەبوونو دڵتەنگیم.

**جینیفر ٣٢ ساڵ، ٦ ساڵە هاوسەرگیرە:** زۆرم پێخۆشە کاتێك کە سووری لەسەر ئەوەی لە ئامێزت بگرمو ماچت بکەم لە کاتێکدا من لە بارودۆخێکی خراپدام، بەڵام هەرچەندە کاروبارم لەوپەڕی خراپیدا بێت من هەست دەکەم کە حاڵم باشتر بووە کاتێك ئەو کارە دەکەم.

**لیندا ٤٠ ساڵ، ١٥ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** وازمەهێنە لە خۆشەویستی لەگەڵمدا، دەست هەڵمەگرە لە خۆنزیك کردنەوەو دەربڕینی وتەی پڕ عیشقو خۆشەویستی، هەروەکو چۆن لە سەرەتای بە یەك گەیشتنماندا وات دەکرد، لەوانەیە تەمەنم گەورە بووبێت، بەڵام من لە ناخی خۆمدا وا هەست دەکەم کە تا ئێستاش کچێکی ١٨ ساڵانم.

**دیبی:** بەیناوبەین دەستی هاوسەرەکەت بگوشە، چونکە ئەمە بۆ ئەو زۆر دەگەیەنێت.

**جانیت ٥٣ ساڵ، بێوەژن دوای ١٦ ساڵ هاوسەرگیری:** بە خۆشەویستیو لە ئامێزگرتنو گوزارش کردن لە هەستو سۆزی جوانو ناسك، ژیان دەبێتە سەمایەکی هێمن نەك جەنگێك هەر لایەك دەیەوێت بەسەر لایەکەی تردا زاڵ بێت.

**مارین ٦٢ ساڵ، ٤٢ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** فێربە بەردەوام بڵێیت: «خۆشم دەوێی» هەڵبەت ئەو هەڵسوکەوتانەی کە گوزارش لە خۆشەویستی دەکەن زۆر جوانو ناوازەن، بەڵام شتێکی جوانە کە جار جار گوێبیستی ئەو وشەیە بیت.

**فکتۆریا ٤٩ ساڵ**، هاوسەرگیری دووەم تا ئێستە «٢» ساڵە: رۆژی سێ جار پێی بڵێ خۆشم دەوێیت، چونکە وشەی «خۆشم دەوێیت» وەکو گوڵ وایە، زوو وشك دەبێت پێویستی بەوە هەیە یەکێك بەردەوام ئاوی بدات، یاخود وەك «مایۆنیز» ماوەی بەکارهێنانی کورتەو زوو بەسەر دەچێت.

**مادی ٤٣ ساڵ، ٢ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە،** کاتێك دێیتەماڵەوە من ماچ بکە، پێش ئەوەی منداڵەکانت ماچ بکەیت.

**جینا ٣٦ ساڵ، ٧ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** کاتێك لە ماڵەوە لە گەڵمان دادەنیشی، پێویستە بیروهۆشت ئامادە بێت، نابێت ئەوەی کە هەموو بیروهۆشی داگیرکردووی تەنها کارەکەتو وەرزش بێت، هەموو هۆشو تەرکیزت بدەرە خێزانو منداڵەکانت، ئەوان قسەت بۆ دەکەن، بەڵام تۆیان لەگەڵ نیت، بەڵکو خەیاڵت بە شتێکی ترەوە سەرقاڵە.

**شیری ٤٣ ساڵ، ١٦ ساڵە هاوسەرگیرە:** گرنگی زیاتر بدە بەوەی لە سنوری خێزانەکەتدا روودەدات، کاتێك رووخسارت لە رۆژنامەکەدا نوقم دەکەیت، پێویستە هەندێك لە کاتت دیاری بکەیت بۆ ئاوڕدانەوە بۆ لای خێزانەکەت، من وا هەست دەکەم کە تۆ ئێمەت لە بیر کردووە، چونکە هەموو کاروباری ماڵو گرنگی دان بە منداڵەکانت کەوتۆتە سەر شانی من.

**لیسلی ٣٦ ساڵ، ٨ ساڵە چۆتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە:** گرنگی زیاتر ببەخشە بە خێزانەکەت، هەوڵ بدە زیاتر خۆت بەشداری کاروبارو لێپرسراوییەکانی بکەیت، ئەرکی پەروەردەکردنی منداڵو یارمەتی دانیان بۆ خوێندنی وانەکانیان بخە ئەستۆی خۆت هاوکات چێژ لەم کارەت وەربگرە.

شێخانی

# تەنها خەندەیەك

بۆ بەخشینی شادمانیو میهرو سۆزو خۆشەویستی زۆرجار تەنها خەندەیەك بەسە، چرپەی دوو وشەی ناسكو نیگایەكی نوورین بەسە بۆ هەڵكردنی شنەو شەماڵی هیوا بەخشو شادی هێنو خەفەتبەر.

بەڵام بەداخەوە زۆرجار بەرامبەر بە كارێكی وەها ئاسانو سانا سستی دەنوێنین!

لە كاتێكدا خەندەو وتەی شیرین كاریگەرییەكی ئەفسوناوی هەیەو وا دەكات لە قوڵایی دڵەكاندا جێگەی خۆمان بكەینەوەو خۆمانو دەوروبەر نوقمی سەعادەتو سەرفرازی بكەین.

با بەیەكەوە سەرنج لە هەڵوێستی ئەم مێردمنداڵە هەست ناسكو دڵپاكە بدەینو وانەیەكی بەرزی لێوە فێر بین:

مێرد منداڵێك لەگەڵ باوكو دایكیدا دەچنە نوێژی هەینیو لە وتاری هەینیدا مامۆستا باس لە بەخشینو پاداشتی بەخشندەیی دەكات، ئەمیش زۆر ئارەزوو دەكات كە بیتوانیایە پارەو سامانی بە هەژارانو لێقەوماوان ببەخشیایە، لەبەرئەوە دوای نوێژی هەینی لە مامۆستای وتاربێژ نزیك بووەوەو بە خەمبارییەوە لێی پرسی: مامۆستا گیان من زۆر حەز دەكەم یارمەتی هەژاران بدەم، بەڵام هیچ پارەیەكم نییە.

مامۆستاش بەوپەڕی ڕێزو خۆشەویستییەوە رووی تێكردو پێی گوت: رۆڵەی شیرینم بەخشین تەنها بە پارە نابێت، بەڵكو دەتوانیت بەشێك لە كاتەكانت ببەخشی بۆ جێبەجێكردنی كاروپێداویستییەكانی ئەو كەسانەی كە پێویستیان پێتە.

تەنانەت بەخشینی خەندەیەك بەخێرو بەخشین دەژمێردرێت.

مێرد منداڵەكە بەم قسانە دڵخۆشبوو، یەكسەر دەستی دایكو باوكی گرتو وتی: دایە گیان بابە گیان چی بكەین؟

باوكی گوتی: دەچین بۆ نەخۆشخانەكانو سەردانی نەخۆشەكان دەكەینو هەواڵیان دەپرسینو دڵخۆشیان دەكەین.

هاوكات هەر سێكیان چوونە نەخۆشخانەیەك لە وێدا چاویان بە پیرەژنێكی نەخۆش كەوت كە تەمەنی (٩٢) ساڵ بوو، شێرپەنجە بە هەموو لاشەیدا بڵاو ببۆوە، كاتێك چاوی هەڵهێناو ئەمانی بینی گوتی: من (٨) مانگە لەم نەخۆشخانەیەمو (١٤) ساڵە لەم نەخۆشخانە بۆ ئەو نەخۆشخانە دەمگوازنەوە! زۆربەی نەخۆشەكانی دەوروبەرم مردنو تەنها من ماومەتەوە، تاڵاویی نەخۆشیو تەنیایی دەنۆشمو هەمیشە لە خودا دەپاڕامەوە كە كەسێك بێتە لام، خۆشی بوێمو خۆشم بووێتو هەواڵم بپرسێو لەم تەنیاییە رزگارم بكات، تا ئێستاش كەس سەردانی نەكردوومو لێی نەپرسیومەتەوە! زۆر سوپاسی تۆ دەكەمو تا دوا هەناسە دوعای خێرت بۆ دەكەم.

مێرد منداڵەكە پێی گوت: ئیتر هەموو رۆژێك دێم بۆ لات، ئیدی رۆژانە سەردانی دەكردو ساتێك لە لای دەمایەوەو دڵخۆشی دەكرد.

رۆژێكیان كاتێك هات بۆ سەردانی پیرێژنەكە بینی قەرەوێڵەكەی چۆڵەو كۆچی دوایی كردووە، تەنها پارچە كاغەزێكی بینی كە لەسەر چەرچەفە سپییەكەی بەجێی هێشتبوو، تیایدا نووسرابوو ... هەر چییەك بڵێم ناتوانم سوپاست بكەم، ئەوەندە دەڵێم سوپاس بۆ خودا بە ڕاستی لە ناخی دڵمەوە خۆشم دەوێیت، من لەم دنیایەدا كەسم نییە لەبەرئەوە بڕیارمدا هەموو سەروەتەكەم دوای خۆم ببەخشم بە تۆ، كە بریتییە لە ٢ ملیۆن دۆلار! .

خۆشەویستانم ئەمە تەنها لە پاداشتی خەندەیەكی جوانو وتەیەكی خۆشدا، چی دەبێت ئەگەر هیچمان لە تواناادا نەبوو بۆئەوەی بیبەخشین، خەندەو بزەی سەر لێوو وشە جوانەكانمان بكەینە خەڵاتو گوڵ پرژێنی دڵەكانی پێ بكەین!!